# چەند چیرۆکێکی فۆلکلۆریی

# ناوچەی پشدەر

**لە زاری (خدر شێخە ئەحمەد)ـەوە وەرگیراوە**

**ئامادەکردنی:**

**ڕێبوار بەکرەجۆیی**

**٢٠٠٨**

www.iqra.ahlamontada.com

ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ـ سلێمانی

ناوی کتێب: چەند چیرۆکێکی فۆلکلۆریی ناوچەی پشدەر
ئامادەکردنی: ڕێبوار بەکرەجۆیی
پێداچوونەوەی: بوار نورەدین
ژمارەی بڵاوکراوە: ٦٧
دیزاینی بەرگ: حەمید ڕەزا ئازموودە
ڕێکخستنی لاپەڕەکان: کاروان سالار
چاپخانە: ئاراس ـ هەولێر
تیراژ: ١٠٠٠
چاپی یەکەم ـ ٢٠٠٨
ژمارەی سپاردن: (١٤٥٤) ساڵی (٢٠٠٨) حکومەتی هەرێمی کوردستان

مافی چاپکردنەوەی بۆ ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد پارێزراوە ©

ناونیشان: عێراق ـ سلێمانی ـ عەلی ناجی
گەڕەکی ١٠٣ ـ کۆڵانی ٥٢ ـ خانوی ژمارە: ٢٢
TELFAX: 0044704-3137233
www.khi03.com info@khi03.com

www.iqra.ahlamontada.com

## ناوەرۆك



www.iqra.ahlamontada.com

# مشك و پشيله

هەبوو نەبوو كەس لە خواى گەورەتر نەبوو. دەگێڕنەوە دەڵێن: گورپە پشيلەيەك هەبوو لە چۆڵەوانييەكدا لە هاوەڵەكانى بەجێدەمێنێ، نازانێ ڕوو لە كوێ بكات، زۆر بێ تاقەت و برسى دەبێ، لەناكاو چاوى بە مشكێكى دەكەوێ، چنگى پێدا دەكا و دەيگرێ.

مشكەكە هەستدەكا پشيلەبۆر خەريكە دەيخوا، ڕوو لە پشيلەكەى دەكا و پێى دەڵێ:

مام پشيلە مەمخۆ، من چم تا بمخۆى! ئەگەر نەمخۆى، وا دەكەم هەموو ڕۆژێ جەرگ و دڵان بخۆى!

پشيلەكەش دەڵێ: چۆن؟

مشكەكە دەڵێ: بابم قەصابى ئەو شارەيە، ئەگەر بەرمدەى، هەموو ڕۆژێ جەرگ و دڵانت بۆ دێنم. پشيلەبۆر بەقسەى مشكەكەى هەڵدەخەڵەتێ و مشكەكەى بەرەڵادەكا، مشكى فێڵبازيش خۆى بە كونێكيدا دەكا و بەو فێڵەى خۆى ڕزگاردەكا. پشيلەى نەگبەتيش



www.iqra.ahlamontada.com

بەرامبەر بە کونەکەی هەڵتروشکاوە[1] و چاوەڕێی مشکەکەی دەکا جەرگ و دڵانی بۆ بێنێ.

دوای ئەوەی مشك دەحەسێتەوە، سەر لەکونەکە دەردێنێ و دەڵێ: مام پشیلە لێرە ماوی؟

مام پشیلەش دەڵێ: ئەرێ وەڵڵا، ئەدی کوا جەرگ و دڵەکانت؟

مشکەکەش لە زالکی[2] کونەکەیەوە دەڵێ: مام پشیلە گوێت لێ بێ حیکایەتێکت بۆ دەگێرمەوە: پشیلە بۆریش چاوی تێدەبڕێ و دەستێکی بەسەر و سمێڵیدا دێنێ، ئەوجا مشکەکە دەڵێ: هەبوو نەبوو، کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، کوڕە جوولەکەیەك هەبوو حەزی لەکچێ پاشایەکی دەکرد. سەرشۆرەکەی (ناترەکە)ی پیرێژنێك دەبێ، ئەویش دەلاڵی کوڕە جوولەکەی دەبێ، کوڕە جوولەکە هەرچەند دەکا نازانێ چۆن بە کچێ پاشای بگا، بۆیە پەنا بۆ پیرێژنێ دەبا و داوای لێدەکا هەر چۆنێکی بێ، دەبێ کچێ پاشای ببینێ.

پیرێژنیش بە کوڕە جوولەکەی دەڵێ: سبەینێ کچێ پاشای دێنمە سەر ئەو زێیەی بەرماڵان، ئەتۆش وەرە لە شوێنێکێ لە نزیکی ئێمە

---

١- هەڵتروشکاوە: کاتێك پشیلە یان هەر گیاندارێکی تر لەسەر پاشووی دانیشێ و بەلام دەست و سنگی نەنوشتابێتەوە و دیاربێت.

٢- زالك: دەرگا، دەروازە.



www.iqra.ahlamontada.com

خۆت حەشاردە، دوای ئەوەی ئاویٚ گەرم دەکەم و کچیٚ پاشای ڕووتدەکەمەوە، بەبێنووی لەبیرچوونی لفکە و سابوونێوە، دێمەوە بۆ مالیٚ و ئەتۆش کە زانیت ئەمن لەویٚ نیم، وەرە و هەموو ئیشێکی خۆتی لەگەلٚدا بکە.

مشکەکە سەرێکی هەلٚبڕی و گوتی: مام پشیلە گوێت لێیە؟

مام پشیلەش لەسەر قوونان دانیشت و میاوێکی بۆ کرد.

ئەوجا مشك دەستیکردەوە بەگێڕانەوەی حیکایەتەکەیی و گوتی: مام پشیلە بۆ سبەینیٚ پیرێژن کچیٚ پاشای هێنایە سەر زێیە و هەموو شتێکی بۆ حازرکرد و ئەوجا ڕووتیکردەوە و بە کچەی گوت: ئەیەڕۆ دەستم شکیٚ...

کچیٚ پاشاش گوتی: ئەوە چ بووە پوریٚ بۆ وا دەلٚێی؟

ئەویش گوتی: ئەیەڕۆ خۆ لفکە و سابوونم نەهێناوە، دانیشە هەر ئێستا بەغارێکی[1] دێمەوە. بەلٚیٚ دوای ئەوەی پیرێژن ڕۆیی و کوڕە جوولەکەش یەقینٚ[2] بوو لەوەی کە کچیٚ پاشای بە تەنێیە، یەکسەر لەو شوێنەی خۆی لێحەشاردابوو، هاتە دەریٚ و خۆی لەکچەی ئاشکراکرد. بەلاٚم کچیٚ پاشای ئاقلٚ بوو، هیچ خۆی تێکنەدا و بە کوڕە جوولەکەی گوت:

---

١- غار: ڕاکردنی خێرا.

٢ - یەقین: دلٚنیابوون.



www.iqra.ahlamontada.com

کوڕە جوولەکە ڕوو لەولای کە، تازە من ئـی تـۆم و تـۆش ئـی مـن، هەتا جلکان لەبەر دەکەمەوە. ئەوجا کوڕە جوولەکـە ڕووی لـە کـچیٚ پاشای وەرگێڕا، کچەش کە زانی ئاگای لێنییـە و خـافڵاوە، سـواری تەختـە شـۆرەکەی بـوو و بـەڕووت و قـووتی خـۆی بـە زێیـەدا دا و ڕۆیشت بۆنێوقەدی[1] زێیە، وەختێکی کوڕە جوولەکە ئـاوڕی دایـەوە، تەماشایکرد کچیٚ پاشای بەڕووت و قووتی گەیشتۆتە نێوقەدی زێیە، زۆر پەشیمان بوو لـەوەی کـە هیـچی لێنـەکرد و بـە ئاسـانی لـە بـن دەستی دەرچوو...

ئـەوجا مـشکەکە گـوتی: مـام پـشیلە، کـوڕە جوولەکـە چـاکیکرد (نەی....).

مام پشیلەش گوتی: نەوەڵڵا چاکی نەکرد، لـە (ق...ی دایـەی...)، ئەمن بام هەر (دەم...). ئەوجا مشکەکە گـوتی: ئـەدی ئـەتۆ بۆچـی ئەمنت نەخوارد، کەنگیٚ بابی من قەصاب بووە، هەتا جەرگ و دڵانت بۆ بێنم؟!

مام پـشیلەش لـە خەفـەتان چـنگێکی پێـدا دەکـا، بـەڵام مـشکەکە خۆی دەکا بە کونێکیدا و لە کونێکی دیکەوە سەردەردێنیٚ و دەڵیٚ:

مام پشیلە هەر لێـرە مـاوی، جـا گوێـت لـێبیٚ: دوای ئـەوەی کـچیٚ پاشای خۆی بە زێیەدا دەدا، مودەتێکی بە ئاوێدا دەڕواتـە خـواریٚ،

---

١ – نێوقەد: نێوەند، ناوەڕاست.



www.iqra.ahlamontada.com

له شوێنێکی چۆڵەوانیدا تووشی ڕاوچییەکی دەبیٚ، خەریکی ڕاوە ماسییە، کابرای ڕاوچی وەختێکی کچەی دەبینیٚ،یەکسەر دەیگرێتەوە، بەو نیازەی بیباتەوە بۆ ماڵیٚ، بەڵام کچیٚ پاشای بەکابرای ڕاوچی دەڵیٚ:

تازە ئەمن ئی تۆم و ئەتۆش ئی من، بەس چۆن ئاوا بەو ڕووت و قووتییەی لەگەڵت بێمەوە؟ ئەگەر ژن یان کچت هەیە، برۆ دەستێك جلکی ژنانە و خواردنی پێدا بنێرە با لە بەریانکەم، ئەوجا هەردووك پێکەوە دێینەوە بۆ ماڵیٚ. کابراش لەخۆشییان قەناعەت دەکا و دەڵیٚ:

زۆر باشە، هەر ئێستا دەچم بۆت دەنێرم...

لێرەدا مشکەکە دەڵیٚ: مام پشیلە گوێت لێیە؟

مام پشیلەش مرەیەکی بۆ دەکا. ئەوجا مشکەکە بەردەوام دەبیٚ و دەڵیٚ:

مام پشیلە کابرا لەخۆشیان هەر بەغاردان دەچێتەوە بۆ ماڵیٚ و دەستێك جلکی ژنانە و خواردنیٚ بە کچەکەیدا دەنێریٚ و چاوەڕێیان دەکا هەتا دێنەوە. وەختێکی کچیٚ کابرای ڕاوچی دەچیٚ بۆ سەر زێیە بۆ کن کچیٚ پاشای، کچیٚ پاشای شتەکانی لیٚ وەردەگریٚ، جلکەکان لەبەردەکا و خواردنەکەش دەخوا، ئەوجا بە کچیٚ کابرای ڕاوچی دەڵیٚ:



www.iqra.ahlamontada.com

وەرە با تۆزێکی سواری ئەو تەختەیەی بین و پیاسەیەکی بە نێو ئەو زێیەدا بکەین، ئەوجا دوایی پێکەوە دەڕۆینەوە بۆ ماڵێ. بەڵێ دوای ئەوەی هەردووکیان سواری تەختەشۆرەکەی[1] دەبن، کچێ پاشای پاڵ بە تەختەکەیەوە دەنێ بۆ نێوقەدی زێیە، ئەوجا هەردووکیان بە زێیەدا دەڕۆنە خوارێ، هەرچەند کچێ کابرای ڕاوچی هاواردەکا، فایدەی نییە و کچێ پاشای قەناعەتی پێدەکا لەگەڵی بڕوا، کابرای ڕاوچیش ئەوە هەرچاوەڕێیە کچەی بۆ بێننەوە، کەچی نەك هەر کچی پاشای، کچەکەی خۆشی لە دەستچوو.

ئەوجا مشکەکە ڕوو لە مام پشیلەی دەکا و دەڵێ: مام پشیلە کابرای ڕاوچی چاکیکرد، کچێ پاشای بە ڕووت و قووتی دەسکەوت و هیچی لێنەکرد؟

مام پشیلەش دەڵێ: ئەوەللا لە (....)ی داکی بەم، ئەمن بام نەمدەهێشت بڕوا هەر (دەم...). ئەوجا مشکەکە دەڵێ: ئەدی ئەتۆ بۆچی ئەمنت نەخوارد؟ کەنگێ بابی من قەصاب بووە، هەتا جەرگ و دڵانت بۆ بێنم؟!

---

١- تەختەشۆر: جاران کە وەك ئێستا (گەرماو) نەبوو، لە ماڵان و سەر چۆم و ڕووباران، تەختەیەکیان دادەنا و خۆیان لەسەر دەشووشت و پێیان دەگوت: تەختەشۆر.



www.iqra.ahlamontada.com

دیسان مـام پـشیله چاپۆکێکی[1] پێدا دەدا، بـەڵام مـشکەکە خـۆی بەکونێکی دیکەدا دەکا و لەکونێکی دیڕا سەر دەردێنیٚ و دەڵیٚ: مـام پشیله هەر لێرە مـاوی؟ مـام پـشیلەش میـاوێکی بۆدەکـات، ئـەوجا مشکەکە دەڵیٚ: جاگوێت لێبیٚ مام پشیله:

ئـەو دوو کـچە، یـەعنی کـچیٚ پاشـای و کـچیٚ کـابرای ڕاوچـی، بـەو زنّییەیدا ڕۆیشتنە خـواریٚ، تـا لـە شـوێنێکی تووشـی دار و دەسـتەی پاشایەکی دێن و دەیانگرن. خەبەریان بۆ پاشای برد کە دوو کـچیان لـەو زنّییـەی بـەر مـاڵان، لـەو حاڵـە و لەوڕەنگـەی گرتۆتـەوە. لـەو مەملەکەتەش وا بڵاوببۆوە کە پاشای ئەو مەملەکەتەی (گول) بـووە، دەبیٚ ئەو کەسەی ئەو نەخۆشییەی دەگریٚ لەگەڵ (٤١) کچی عازەب دا بنویٚ، ئەوجا چاك دەبێتەوە، هـەتا ئـەودەمیش پاشـا (٣٩) کـچی پەیداکردبوو، بەو دوو کچەش حسابەکەی تەواودەبوو. بەڵیٚ ئـەو دوو کچەشیان بۆ پاشای بـرد، کـچیٚ پاشـاش چـونکە ئـاقڵ بـوو لـەفێڵی پاشـای گەیـشت. هـەر بۆیـە بەکـچەکانی گـووت: کـیٚ لـەئێوە بـابی (نەجاڕ– دارتاش)ە؟ یەکێك لەکچەکان گوتی: ئـەمن بـابم نـەجاڕێکی بەناوبانگـە. کـچیٚ پاشـاش دەڵـیٚ: باشـە دەتـوانی پێـی بڵێـی هـەتا سبەینیٚ بەلەمێك دروستکا جێی (٤١) کەسی تێدا بێتەوە و بیشیباتە سەر ئەو زنّییەی و لە شوێنێکی بیشارێتەوە. ئـەویش دەڵـیٚ: باشـە و

---

١ – چاپۆك: چنگ پێداکردن بە هەردوو دەست یان بەدەستێك.



www.iqra.ahlamontada.com

ڕاسپاردەکەی جێبەجێدەکات، کچەش خەبەردەداتە بابی و دەڵێ حاڵ و مەسەلە ئاوایە. بۆ ئەوەی لەدەستی پاشای رزگارمان بێت، دەبێ بەلەمێکن بۆ دروستکەی بەو شێوەیەی و بیشیبەیە سەر ئەو زێیەی و بیشاریەوە. بابیشی خەبەری دەداتەوە کە خەمیان نەبێت و تا سبەینێ بەلەمەکەیان بۆ حازردەکا. وەختێکی شەوێ، پاشا دەیەوێ بچێتە کن[1] کچەکان، کچێ پاشای ڕوو لەپاشای دەکات و دەڵێ: پاشا ئەتۆ کابرایەکی دنیادیدەی، چۆن هەروا دێیە کنمان، ئێمە هەندێکن لە (...) و هەندێکن پیسین، وابکە سبەینێ دار و مەنجەڵ و ئاگرن بۆ بەرنە سەر ئەو زێیەی، لەوێ کوڵێ دەکەین و خۆمان دەشۆین و خۆمان حازردەکەین، ئەوجا سبەینێ شەوێ وەرە کنمان، پاشاش بەو قسەیەی قەناعەتی کرد و گوتی: باشە، بۆ سبەینێ ڕاسپاردەکەیانی جێبەجێکرد، هەموو شتێکیان بۆ بردنە سەرزێیە، وەختێکی خەبەریان بۆ پاشای هێنا، گوتیان: پاشا نەکچ ماوە و نەدار و نەئاگر، هەموویان سواری بەلەمێکی بوون و بەزێیەدا ڕۆیشتوونەتە خوارێ، پاشاش لەو فێڵەیان سەری سووڕدەمێنێ و دەسەلاتی نامێنێ ئەوەندە نەبێ دەڵێ : ئەمن بە تەنێ بەدوویان دەکەوم.

---

١ – کن: لێرەدا بەمانای لاقەکردن دێت.



www.iqra.ahlamontada.com

لێرەدا جارێکی دیکە مشکەکە دەڵێ: مام پشیلە پاشا چاکیکرد (نەی..)ن؟

مام پشیلەش دەڵێ نەوەللا لە (...)ی داکی پاشای بەم، ئەمن بام نەمدەهێشت هیچیان برۆن، هەموویانم (دە...).

ئەوجا مشکەکە دەڵێ: ئەدی بۆچی ئەتۆ ئەمنت نەخوارد؟ کەنگێ بابی من قەصاب بووە، هەتا هەموو ڕۆژێ جەرگ و دڵانت بۆ بێنم؟!

دیسان پشیلە بۆر،چاپۆکێکی پێدادەدا، بەڵام مشکەکە خۆی بەکونێکی دیکەدا دەکا و لەکونێکی دیکەوە سەر دەر دێنێتەوە دەرێ و دەڵێ: مام پشیلە هەر وازناهێنی؟ ئەوجا گوێت لێبێ: دوای ئەوەی ئەو (٤١) کچە بە سواری ئەو بەلەمەی بەو زێیەیدا دەڕۆنە خوارێ، لە چۆڵەوانییەکیدا تووشی (٤١) چەتەی دەبن، هەر چەتەی کچێکی بۆ خۆی دەگرێتەوە، کچێ پاشاش چونکێکم زیرەك و ئاقڵ دەبێ، بە چەتەکان دەڵێ: پێویست ناکا بەزۆری ئەو کارەی کەین، مادام وایە بنێرن بۆ شاری باچێشت و گۆشتێکی زۆرمان بۆ بێنن، لێرە لێی دەنێین و سەیرانێکی خۆش دەکەین و پاشان هەر کەسە و لەگەڵ دەزگیرانی خۆی ڕابوێرێ و بڕواتەوە بۆماڵێ.

هەموو چەتەکان گوتیان: زۆر باشە، سەرکردەی چەتەکانیش چەند کەسێکی نارد بۆ ئەوەی بچن چێشت و گۆشتێکی چاك بێنن، کچێ



www.iqra.ahlamontada.com

پاشـاش بـەبێنویٚ[1] هەنـدێك پێویـستی ژنانـە، یـەكێكی لەكـچەكانی ڕاسپارد هەتا لەگەڵیان بچیٚ و دەرمانی بێهۆشـیان بـۆ بێنـیٚ، لێـرەدا مشكەكە گوتی: مام پشیلە گوێت لێیە؟

مام پـشیلەش برسـێتی تینـی بـۆ هێنـابوو، لەسـەرلا لێیكـەوتبوو، نووزەیەكی بۆ كرد، چاویشی بڕیبووە زالكی كونەكەی.

ئـەوجا مـشكەكە گـوتی: مـام پـشیلە دوای ئـەوەی چـەتەكان گەڕانـەوە، نـان و چێـشتێكی زۆریـان حـازركرد، كـچیٚ پاشـای داوای لێكـردن هـەموو دانیـشن بـۆ نـان خـواردنیٚ، وەختێكـی چێـشت و گۆشـتەكەیان تێـدەكرد، هەرچـی لای چـەتەكان بـوو كـچیٚ پاشـای دەرمانی بێهۆشـی بـۆ تێكـردن، دوای ئـەوەی نـان و چێـشت تێكـراو هەموو بەرامبەر یەكدی دانیـشتن، ئـەوەی تـۆزێكی نـانی دەخـوارد، بـەلادا دەهـات و بێهـۆش دەبـوو، ئـەو دەرمانـە وای لێكـردن هـەموو چـەتەكان بێهـۆش بـن، ئـەوجا هـەموو كـچەكان جلكـی چـەتەكانیان لەبـەر خۆیـان كـرد و جلكـی خۆشـیان لەبـەر چـەتەكان كـرد و هـەر یەكەیان لایەكی برۆ و لایەكی سمێڵیان بۆ تاشین و بەجێیان هێشتن.

بـەڵیٚ دوای ئـەوەی چـەتەكان بـەهۆش خۆیـان دێنـەوە، هیـچیان بەدەست نامێنیٚ، هەر ئەوەندە نەبیٚ هەموویان بەیەكدی پێدەكەنن،

---

١- بێنوو: بیانوو، هەنجەت.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوجا مشکەکە دەڵێ: مام پشیلە ئەو چەتانە چاکیان کرد هەروا بەئاسانی هەڵخەڵەتان و کچەکانیان لەدەستچوو؟

ئەویش گوتی: نا وەڵڵا ڕوویان ڕەش بێت، ئەمن بام نەمدەهێشت هیچیان بۆی دەرچن، هەموویانم (دە...). ئەوجا مشکەکە گوتی: ئەدی بۆچی ئەتۆ ئەمنت نەخوارد، کەنگێ بابی من قەصاب بووە هەتا جەرگ و دڵانت بۆ بێنم؟

دیسان پشیلە بۆر چاپۆکێکی پێدادەدا و ئەویش خۆی دەکونەکەی دەهاوێتەوە و لەلایەکی دی سەر دەردێنێتەوە و دەڵێ: مام پشیلە گوێت لێبێ، دوای ئەوەی ئەو (٤١) کچە بەجلوبەرگ و ئەسپی چەتەکانەوە ڕۆیشتن، تووشی مەملەکەتێکی بوون پاشای ئەو مەملەکەتەی مردبوو، لەدوورێڕا چاویان بە قەرەباڵغییەکی کەوت و نەیاندەزانی چ خەبەرە؟ دوای ئەوەی پرسیار دەکەن، پێیان دەڵێن پاشای ئەو مەملەکەتەی مردووە و عادەتیش وایە ئەگەر پاشا مرد (باز)ی بۆ هەڵدەدەن، بۆ ئەوەی یەکی دی لەجێ دانێن. بەڵێ ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی ڕاوەستان، چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد داخوا کێ دەبێتە پاشا؟ دوای ئەوەی (باز) یان هەڵدا، بازەکە بەسەر سەری کچێ پاشایەوە نیشتەوە، بەڵام خەڵکەکە پێی ڕازی نەبوون و گوتیان نایناسین و نابێت ببێ بەپاشا، دوای ئەوەی چەند کەڕەتان بازیان هەڵدایەوە، هەر بەسەر سەری کچێ پاشای



www.iqra.ahlamontada.com

دەنیشتەوە، هەربۆیە خەڵکەکە ناچاربوون بیکەن بەپاشای خۆیان.
بەڵێ کچەیان کرد بە پاشا و هەردوو ژنی پاشای کۆچکردووشیان لێمارەکرد و کەسیش نەیدەزانی ژنە یان پیاوە.

هەرچەندە مام پشیلە لەبرسان لاکە لاکی بوو هەر نووزەی دەهات، بەڵام مشکەکە گوتی:

مام پشیلە، دوای ئەوەی کچی پاشای بوو بەپاشای ئەو مەملەکەتەی ئەمری دەرکرد هەر چوار دەوری مەلەکەتەکەی بۆ بکەن بە شوورە، لەبەر دەرگای مەملەکەتەکەشی میوانخانەیەکی دروستکرد و وێنەی هەر (٤١) کچەکەشی لێ هەڵواسی. داوای لەدار و دەستەکانیشی کرد، هەرچی لەوێوە ڕەتبوو وئاهێکی بۆ ئەو ڕەسمانە هەڵکێشا، بۆی بگرن و بۆی بێنن.

بەڵێ دوای ئەوەی مودەتێك بەسەر پاشایەتی کچێ پاشایدا تێپەڕی، ڕۆژێکی بابی کچەی هات، یەعنی پاشا، هەر چاوی بە وێنەکە دەکەوێ، ئاخێکی قووڵی بۆ هەڵدەکێشێ، نۆبەتداری میوانخانەکەش، یەکسەر دەیگرێت، هەرچەند دەڵێ کاکە بۆ دەمگرن خۆ من پارەی خۆم داوە، ئەوانیش دەڵێن: ئەمری پاشایە و دەیبەن بۆ کن پاشای، کچەش یەعنی (پاشا) کە دەزانێت بابیەتی، دەڵێت: بیبەن بۆ ژوورێکی باش و خزمەتێکی باشی بکەن.



www.iqra.ahlamontada.com

پاش ماوەیەکی دیکە،کوڕە جوولەکە دێ و چاوی بەوێنەکە دەکەوێ، ئەویش ئاخێکی بۆ هەڵدەکێشێ، نۆبەتدارەکان ئەویش دەگرن و دەیبەن بۆ پاشای، پاشاش دەڵێ: بیخەنە ژوورێکی تاریك و هیچیشی مەدەنێ، ئەوجا دوای ئەوەی یەك لە دوای یەك کابرای ڕاوچی و پاشای گولە و کەس و کاری هەموو کچەکان دێن و بەهەمان شێوە دەگیرێن، ئەوجا کچێ پاشای بڕیاردەدا مەحکەمەی هەمووان بکا، هەر بۆیە هەمووان بانگدەکا و لە پێشەوە لە کوڕە جوولەکەی دەپرسێ: بەدوای چ کەوتووی؟

ئەویش سەرگوزشتەی خۆیی و حەزلێکردن لەکچێ پاشای بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش پێی دەڵێ: خۆ هیچت لێ نەکرد؟ ئەویش سوێندی بۆ دەخوا دەستیشی بەر دەستی نەکەوتووە.

پاشا دەڵێ: باشە جارێ لەولای ڕاوەستە، ئەوجا لەکابرای ڕاوچی دەپرسێت: ئەتۆ بەدوای چ کەوتووی؟ ئەویش باسی ئەو ڕۆژەی بۆ دەکات ئەگەر کچێکی لەناو زێیەدا بەڕووتی گرتۆتەوە و بەکچەکەی خۆیدا جلك و خواردنی بۆ ناردووە بۆ ئەوەی بێتەوە بۆ ماڵێ، کەچی کچەکەی خۆشی دیارنەماوە و بەدوای سۆراغی کچەکەی کەوتووە. بەو شێوەیە تا پرسیار لەهەمووان دەکا و گوێی لەسەرگوزشتەی هەمووان دەبێ، پاشان خۆی ئاشکرا دەکا و هەموو لایەك بەیەك شاد دەکاتەوە و بابی لەجێی خۆی دەکاتە پاشا و



www.iqra.ahlamontada.com

ژنـەکانیش لـەبابی مارەدەکـا و هـەمووان بـۆ مەملەکـەتی خۆیـان بەرێدەکاتەوە، ئەوجا

مشکەکە دەڵێت: مام پشیلە، مام پشیلە، چەند بانگی دەکا، جواب ناداتەوە، وەختێکی دەزانێ مـام پـشیلە لەبرسـان بـەلادا هـاتووە و تۆپیوە، ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# پاشای وەجاخ کوێر[1]

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، دەگێڕنەوە دەڵێن پاشایەك دەبێ، ساحێبی مەملەکەتێك و سەروەت و سامانێکی زۆر دەبێ، دوو ژنیشی دەبێ، بەڵام هیچ منداڵی نابێ. ئەو پاشایە خزمەتکارێکی زۆری دەبێ. لەناویاندا سەرتاشێکی دەبێ. ڕۆژێك لەڕۆژان بانگی سەرتاشەکەی دەکا و دەڵێ: سەرم بۆ بتاشە. سەرتاشەکەشی دەڵێ: باشە و خێرا دەچێ کەرەسەی سەرتاشینەکەی دێنێ و دەستدەکا بەسەرتاشینی. وەختێکی پاشا سەیری بەردەمی خۆی دەکا، چاوی بەمووی سپی سەری خۆی دەکەوێ. زۆر خەفەتی پێ دەخوا و دەستدەکا بەگریان. کابرای

---

١- زۆرێك لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان، وێکچوونی تەواو و ناتەواو دەکەوێتە نێوانیان. بۆنموونە: لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە فۆلکلۆرییەدا، هاوشێوەیەکی لەکتێبی (قوتووی عەتار- قوتووی دووەم)دا دەدۆزیتەوە، کەڕەنگە لەچیرۆکی نێو کتێبی دیکەشدا هەبێ... کە لەزۆر خاڵدا تەواو وێکدەچن و لەهەندێ خاڵیشدا زۆر جیاوازن. لەڕاستیدا ئەم کارە پێویستیی بە بەدواداچوون و بەراورد هەیە... ئەم چیرۆکە و چیرۆکێکی نێو کتێبی ناوبراو، لەهەندێ خاڵدا هاوشێوەن و لەهەندێکی دیکەدا جیاواز. بڕوانە: ئارارات ئەحمەد، لەبڵاوکراوەکانی ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، ٢٠٠٨، چ (ئاراس)، حیکایەت و ئەفسانە، چیرۆکی ئەحمەد پاشا، لا: ٢٢٦.



www.iqra.ahlamontada.com

سەرتاشیش کەدەبینێ پاشا دەگری، دەڵێ: ئەوە چییە پاشا دەتهێشێ؟

پاشاش دەڵێ: (نەء) و هەناسەیەکی قووڵی بۆ هەڵدەکێشێ.

دوای ئەوەی سەرتاشەکە سەری پاشای دەتاشێ و دەڕوا، پاشاش زۆر خەفەت لەپیربوونی خۆیی و بێ پاشەواری[1] خۆی دەخوا. بۆ سبەینێ پاشا لەخەفەتان و بۆ دڵنەوایی خۆی بەتەنیا ڕوو لەچۆڵەوانییەکی دەکات. دوور و نزیك چاوی بەدەروێشێکی کەشکۆڵ لەکۆڵ دەکەوێ و دەچێتە کنی و

دەروێشەکەش دەڵێ: ها پاشا بۆ کوێ دەچی؟

پاشاش دەڵێ: مادام دەزانی پاشام، دەشزانی بۆ کوێ دەچم!

ئەوجا دەروێشەکە ڕووی لەپاشا کرد و گوتی: پاشا شتێکت پێدەڵێم، ئەگەر بە قسەم بکەی زەرەر ناکەی، بەڵام بەمەرجێك!

پاشا دەڵێ: چۆن؟

دەروێشەکە دەڵێت: سێوێکت دەدەمێ بیکە بەسێ بەشی وەك یەك، بەشێکیان بۆ خۆت بخۆ، دوو بەشەکەی کەبدە بەهەردوو ژنەکانت و دوای ساڵێکی، دوو کوڕت دەبێ. لەو دوو کوڕانە، یەکیان ئی منە، پاشا لە خۆشی ئەوەی گوتی: دوو کوڕت دەبێ، ئەوەندە بیری لەسەوداکەی نەکردەوە و بەمەرجەکەی ڕازی دەبێ و بەپەلە

---

١– پاشەوار: پاشماوە، بەڵام لێرەدا بە مانای (نەوە) دێ.



www.iqra.ahlamontada.com

دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و سێوەکەی دەستی دەکات بەسێ بەشی وەك یەکەوە، بەشێکی بۆ خۆی دەخوات و دوو بەشەکەی دیکەش دەدا بە هەردوو ژنەکەی، دوای کەمتر لەساڵێکی ژنەکانی هەر یەکەی کوڕێکیان دەبێ، یەکیانی ناونا ئەحمەد و ئەوی کەیان مەحموود.

چەند عەیامێك تێپەڕی و منداڵەکان گەورەبوون، ڕۆژێکی ئەو دوو کوڕە،دوو نەمامیان چاندن وگوتیان: با ئەو دوو نەمامە نیشانەی مان و نەمانی هەردووکمان بێ. ئەگەر هەر کاممان دیارنەماین یان ونبووین، با وشکبوونی نەمامەکان نیشانەی بێ. بەڵێ کوڕەکان بەتەواوی گەورەبوون و پاشاش زۆر کەیف خۆشە پێیان، بەلام خۆشحاڵی پاشا هێندەی نەخایاند؟ چونکە ڕۆژێکی دەروێش دێ بۆ کن پاشای، خەبەر دەدەنە پاشای و دەڵێن: دەروێشێك لەو حاڵە و لەو ڕەنگەی هاتووە، پاشاش دەڵێ: بابێتە ژوورێ، وەختێکی دەروێش دێتە ژوورێ و پاشا چاوی پێدەکەوێ، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ و ئەمر بەدار و دەستەکەی دەکا و دەڵێ: دەروێش چی دەوێ بیدەنێ. ئەوجا دەروێش ڕوو لەپاشای دەکا و دەڵێ پاشا من بۆ ماڵی دنیایە نەهاتووم، بۆ خۆت باش دەزانی ئەمن بۆچ هاتووم!

پاشاش دەڵێ : باشە من لەسەر وەعدی خۆم ماوم، با ئێوارێ کوڕەکان بێنەوە لەڕاوێ، کامیانت دەوێ، لەگەڵ خۆتی بەرە. بەڵێ ئێوارێ ئەحمەد و مەحموود گەڕانەوە و بەخێرهاتنی دەروێشیان کرد



www.iqra.ahlamontada.com

وداوایـان لێکـرد چـی دەوێ تـا بـۆی جێبەجێکـەن. دەروێـشیش لەمەسـەلەی نێـوان خـۆیی و پاشـای بابیـان حـاڵیکردن. هەرچـەندە زۆریان پێناخۆش بوو کە لێکدادەبڕێن، بەڵام گفتی بابیانە و نـاتوانن لێی لادەن. ئەوەبوو دەروێش، ئەحمـەدی لەگـەڵ خـۆی بـرد. بـەڵام ئەحمەد چونکە پاشازادە بوو نەیدەتوانی بەپێیان بـڕوا، هـەر بۆیـە لــەدوا دەروێــشیەوە دەڕۆی. وەختێکــی چــاوی بەتەپۆلکەیــەکی دەکـەوێ و لەسـەری دادەنیـشێ، بەئـەمری خـوای ئـەو تەپۆلکەیـە لەئەحمەدی بەدەنگ دێ و دەڵێ: ئەحمەد دەزانی ئەوە کێیە لەگەڵی دەڕۆی؟

ئەحمەدیش دەڵێ: نەوەڵڵا نازانم!

تەپۆلکەکـەش دەڵـێ: ئـەوە دێـوە، لەگـەڵ خـۆی دەتبـا بـۆ نـاو غارێکی[1] گەورە و ترسناك. لەو غارەیدا چەندەها ژووری جۆراوجۆری تێدایە، لەهەیوانی غارەکەیدا دوو مەنجەڵی گەورەی چێشتی لەسـەر ئاگری داناوە و دەکوڵن، ئاگاداربە، دوای ئەوەی هـەموو ژوورەکانـت نیشاندەدا، پێت دەڵێ: ئەو مەنجەڵانە داگرە بـا نـانی بخـۆین، بـەڵام ئـەو دەیـەوێت لەمەنجەڵـەکان نزیـك بیـەوە بـۆ ئـەوەی بتخاتـە نـاو مەنجەڵەکەوە و بتکوڵێنێ و بتخوا، بەڵام ئەتۆ پێـی بڵـێ ئـەمن قـەت شتی وام نـەکردووە، باجـارێکی چـاوم لەئـەتۆ بـێ، دوایـی ئـەمنیش

---

١- غار: ئەشکەوت.



www.iqra.ahlamontada.com

وادەکەم. ئەگەر گوتی باشە و دەسکی مەنجەڵەکانی گرت، ئەتۆش پاڵێکی پێوە نێ و بیخە ناو مەنجەڵەکەوە، بەڵام ئەگەر گەڕایەوە و ڕزگارت بوو لەدەستی، دەبێ گومەزێکم لەسەر دروستکەی، دەنا ڕێگات لێهەڵە دەکەم. ئەو وەختەی ئەحمەد و تەپۆلکەکە ئەو مشت و مڕەیان بوو، دەرویش وردە وردە هەر دەڕۆی، بەڵام وەختێکی هەستدەکات ئەحمەدی بەدواوە نییە و دەیبینێ لەسەر تەپۆلکەیەکی دانیشتووە، بۆیدەگەڕێتەوە و زللەیەکی لێدەدا و هەرچی خواردوویەتی دەیهێنێتەوە، دوایی لەسەر شانی خۆی دادەنێ و دەیبا هەتا ناو غارەکەی دینانێ و دەبێتەوە بەدێو.

وەختێکی دەگەنەجێ، کلیلی هەموو ژوورەکانی دەداتە دەست ئەحمەد و دەڵێ ژوور بەژوور بگەڕێ، ئەحمەد و دێوەکە پێکەوە هەموو ژوورەکان دەگەڕێن، بەڵام ئەحمەد کەدەبینێ بۆ ئەسپەکانی ئێسکی ڕۆکردووە و بۆ تاژییەکانیشی جۆ، سەری دەسووڕمێ! ئەحمەد هەر لەخەیاڵی نەسیحەتی تەپۆلکەکەدا دەبێت، بەڵام دێوەکە خەیاڵەکەی دەپچڕێنێ، وەختێکی پێی دەڵێ: با بچینە هەیوانێ ئیسراحەتێکی کەین.

بەڵێ ئەحمەد دوای دەکەوێ، دوای ئەوەی دادەنیشن و ئیسراحەت دەکەن، دێوەکە بەئەحمەدی دەڵێ: ئەو مەنجەڵەی داگرە باشتێکی بخۆین، ئەحمەدیش دەڵێ: ئەمن قەت شتی وامنەکردووە، با جارێکی



www.iqra.ahlamontada.com

چاوم لە ئـەتۆ بێـت، ئـەوجا ئـەمنیش وا دەکـەم، دێوەکـە بـەوە زۆر تووڕەدەبێت و هەڵدەسـتێ و سـەرقاپی مەنجەڵـەکان لادەدا و خـۆی بەسـەر مەنجەڵێکیانـدا شـۆڕدەکاتەوە بـۆ ئـەوەی هـەڵیگرێ، لەودەمەشدا ئەحمەد پاڵێکی پێوەدەنێ و دەیخاتە ناو مەنجەڵەکەیی و سـەرقاپەکەی دادەخاتـەوە هـەتا کلۆکـۆی دادەمـرێ. ئـەوجا هەڵدەسـتێ دەرگـای ژوورەکـان دەکاتـەوە و ئەسپێك و تاژییـەکی دێنێتە دەرێ و زێڕ و زیوێکی زۆریش لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەڕوا، لەڕێیـە تووشـی بێـشەلانێکی[1] دەبـێ و دەبـینێ دێڵـە شـێرێکی لێکـەوتووە و هـەر هاواردەکـا، ئەحمـەدیش نازانـێ مەسـەلە چییە؟ بەڵام وەختێکی لێی نزیك دەبێتەوە، دەبینێ ئـەوە لاقـی ئاوساوە و ڕاگیراوە و ئازارێکی زۆری هەیـە، بۆیـە ئەحمـەد بـەبێ دەنگـی پەلـە قامیـشێکی تیـژ دەکـا و لـەلاقی دەهـاوێ و خـۆی دەشـارێتەوە. دێڵەشێر لەتاو ئازاری لاقی هاواردەکـا: ئـەوە کـێ بـوو ئازاریـدام، تـا لـەت و پـەتی کـەم و لـەناوی بـەرم؟ بـەڵام ئەحمـەد نـەیوێرا خـۆی لێئاشکرا کا، هەتا دێڵە شێرەکە ئازارەکەی نەما، ئەوجا گوتی:

ئەوە کێ بوو ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردم، تـا چـاکەکەی بدەمـەوە و چەند جارێکی هاوارکرد؟ ئەوجا ئەحمـەد خـۆی ئاشـکرادەکا و دێڵـە شـێرەکەش گـوتی: چـت دەوێ تـا بـۆت بکـەم؟ ئـەویش گـوتی:

---

١- بێشەلان: بیشەلان، شوێنی چڕ وپڕ لە دار و درەخت.



www.iqra.ahlamontada.com

بەچکەیەکم دەویٚ، هەرچەندە دێڵەشێرەکە زۆری پێناخۆش بوو، بەلام تازە وەعدی دابۆیە، بۆیە گوتی بەچکەکانم لەو دیو ئەو بێشەلانەی یاریدەکەن، برۆ پێیان بڵێ: داکتان مردووە، هەرچی پێکەنی، ئەوەیان بێنەوە و لەگەڵ خۆتی بەرە. بەڵێ دێڵە شێرەکە چی گوت، ئەحمەد وایکرد و بەچکەیەکی لەگەڵ خۆی هێنایەوە و ئەوجا لەگەڵ خۆی برد. لەرێگایە تووشی شوانێکی دەبێ و پێی دەڵێ: مەرێکم پێبفرۆشە، تەنها ورگ و ریخۆڵەکەم دەوێ و گۆشتەکەی بۆ خۆت، بەو مەرجەی شوانەکەی رازی دەکا و مەرەکەی هەر لەوێدا سەردەبرێ و ورگ و ریخۆڵەکەی دەردەهێنێ و لەگەڵ خۆی دەیبا و گۆشتەکەی بۆ کابرای شوان بەجێدێڵێ. بەڵێ دەروا تا دەگاتە نزیك شارێکی و لەوێ، ورگی مەرەکەی بەسەری خۆیدا دەکا و پێستەکەشی لەبەردەکا و خۆی وەك کورە کەچەڵە لێدەکا، ئەوجا لەئەسپ و تاژییەکەی و شێرەکەی، هەریەکە موویەکیان لێدەردەهێنێ و بەرەلایان دەکا، ئەوجا خۆی وەك کورە کەچەڵە لێدەکا و دەروا بۆ ناو شاری و لەوێ دەبێ بەباخەوانی کابرایەکی، ئەو باخەش بەرامبەر ماڵی پاشای ئەو شارەی دەبێ. رۆژێکی ئەحمەد (کورە کەچەڵە) زۆر بێ تاقەت دەبێ و دەڵێ: خۆ لەناو ئەو باخەیدا کەس دیارنییە، بۆ بەئەسپەکەم هەندێك رمبازێنێ نەکەم، ئەوجا هەڵدەستێ موویەکی لەمووی ئەسپەکەی



www.iqra.ahlamontada.com

هەڵـدەپڕوزێنێ و ئەسـپەکەی دێ و دەسـتدەکا بـەڕمبازێن. لـەو کاتەشدا کـچی چـووکی پاشـای لەدەلاقـەی[1] باڵەخانەکەیەوە چـاوی لەئەحمەدیە کەچ دەکا، هەربۆیە یەکسەر ئاشقی دەبێ، دوای ئەوەی لـەڕمبازێنێ بێتاقـەت دەبـێ، ئەسپەکەی بەرەلادەکاتـەوە و خـۆی دەکاتەوە بەکوڕە کەچەڵەی جاران و کچێ پاشـاش ئاگـای لەهـەموو شتێکی دەبێ.

دوای چەند ڕۆژێك، کچی چووکی پاشای بەدوو خوشکە گەورەکـەی دەڵێ: ئێوە هەردووکتان گەورە بوون و بە نێوکەوتوون، با بـەبابمان بڵـێین تـەگبیرێکمان لێبکـا. کـچەکانیش دەڵـێن: ئنجـا کـێ دەوێـرێ ئەوەی بەبابمان بڵـێ، کـچی چـووکیش دەڵـێ: خـەمتان نـەبێت، مـن تەگبیرتان بۆ دەکەم، کچەکانیش گوتیان: چۆن؟

ئەویش گوتی: سێ کاڵەکان بۆ بـابم دەنێـرم، یـەکیان بـڵ، یـەکیان گەیشتوو، یەکیان ماتەدراو[2].

بـەڵێ سـێ کاڵەکەکـەی دانـە دەسـت پیـاوێکی بـابی و بردنـی بـۆ پاشای، پاشاش گوتی: چەقۆیەکی بێنن با بیان خـۆین، پیاوەکـەش گوتی پاشا ئەوانە بۆ خواردنێ نین،

---

١ - دەلاقە : کونێکە وەکو پەنجەرەیە دەکرێتە دیوار بۆ ڕووناکی، هەندێ جاریش وەك رەفەی شت لەسەر دانان بەکاردێت، بەڵام لێرەدا بە مانای پەنجەرە دێت.

٢- ماتەدراو: واتە کاڵەکێك هێشتا پێ نەگەیشتبێ.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا گوتی: ئەدی چییە بۆچت هێناون؟

پیاوەکەش گوتی: ئەو کاڵەکە (بڵە) کچە گەورەکەتە، ئەو کاڵەکە گەیشتووەش کچی ناوەنجیتە، ئەوماتە دراوەش کچی چووکتە و داوای مێردی دەکەن.

پاشاش دەڵێ: زۆر باشە و داوادەکا هەرچی جاحێڵی ئەو شارەی هەیە کۆیکەنەوە، لەسەربانی کۆشکێڕا کچەکانم سێویان بەکێ دادا، دەیاندەم بەوان.

بەڵێ هەرچی جاحێڵی ئەو مەملەکەتەی بوو لەبەردمی ماڵی پاشای کۆیان کردنەوە و داوایان لەکچەکانی پاشای کرد کەهەر کەسە و سێوی خۆی بەو کەسەی دادا کەدەیەوێ مێردی پێبکا. ئەوەبوو کچی گەورەی پاشای سێوی خۆی بەکوڕی وەزیری دەستە ڕاستی بابی دادا و کچی ناوەنجیش سێوی خۆی بەکوڕی وەزیری دەستە چەپی بابی دادا، بەڵام کچێ چووکی سێوی خۆی هەڵنەدا و خەبەریان بۆ پاشای برد، حاڵ و مەسەلە ئاوایە.

پاشاش گوتی: کێ ماوە بیهێنن؟ گوتیان: وەڵڵا کەس نەماوە، تەنها کوڕە کەچەڵێکی باخەوان نەبێت، پاشاش گوتی: بڕۆن بیهێنن. بەڵێ کوڕە کەچەڵەیان هێنا، هەر کەکچی چووک چاوی پێکەوت، یەکسەر سێوی خۆی پێدادا. خەبەریان دایە پاشای، پاشاش گوتی:



www.iqra.ahlamontada.com

نابیّ با جاریّکی دیکە سیّوەکەی هەڵداتەوە، دیسان کچیّ پاشای سیّوەکەی پیّدادایەوە و

پاشاش گوتی: هەرنابیّ ئەو کەچەڵە کیّیە؟ دیسان بۆ جاری سیّیەم کچیّ پاشای سیّوەکەی پیّدادایەوە، پاشاش گوتی: بیبەن لیّی مارەکەن، بەڵیّ کچەیان لەکوڕە کەچەڵەی مارەکرد و ئەوجا

پاشا گوتی: بیانبەن لەدەری شاری کاولە خانوویەك و هەندیّ باراش و زوڕاتیان[1] بدەنیّ. ئەوەبوو فەرمانی پاشایان جیّبەجیّکرد.

دوای ماوەیەکی خەبەر بڵاوبۆوە وگوتیان: پاشا کوێر بووە و لەدوای دکتۆر و حەکیمانیان نارد، ئەوانیش بۆیان تەماشاکرد و گوتیان: دەبیّت شیری شیّری لەمەشکیّ شیّری لەپشتی شیّری ببەستریّ و بۆ پاشای بیّنن، بیخوات چاك دەبیّتەوە. داوایان لەپاشای کرد کەزاوایەکانی بنیّریّ بۆئەوەی ئەو دەرمانەی بۆ پەیداکەن.

بەڵیّ زاوایەکانی پاشای هەریەکەی سواری ئەسپیّکی بوو، لیّیدا ڕۆیشت، ئەحمەدیش بەخیّزانی خۆی، کچی چووکی پاشای گوت: بڕۆ بەبابت بڵیّ ئەگەر ئەسپیّك، بارگینیّك هەبیّ، ئەمنیش دەچم بۆ سۆراغی ئەو دەرمانەی. ئەوەبوو کچیّ پاشای چوو بۆ ماڵیّ بابی و

---

١ – زوڕات: جۆریّکە لەدانەویّلە وەکو گەنم و جۆ.



www.iqra.ahlamontada.com

بەبابی گوت: بابە کوڕە کەچەڵە دەڵێ: ئەگەر ئەسپێك هەبێت منیش دەچم، پاشاش گوتی: بارگینە پشت کرمێیەکەی بدەنێ بابڕوا.

بەڵێ، ئەحمەد سواری بارگینە بۆری بوو، هەتا لەئاوایی چووە دەرێ، ئەوجا لەوێ بارگینەکەی لەلاخرێکی بەستەوە و موویەکی لەمووی ئەسپەکەی و بەچکە شێرەکەی هەڵپرووزاند و دەستبەجێ ئەسپەکەی و بەچکە شێرەکەی گەیشتنەجێ، یەکسەر سواری ئەسپەکەی بوو ڕۆیشتەوە بۆ کن ئەو دێڵە شێرەی کەلاقی ئاوسابوو و ڕزگاریکردبوو، دێڵە شێرەکە لێی هاتە قسە و گوتی: ها ئەحمەد چییە بۆچی هاتوویەوە؟

ئەحمەدیش گوتی: پاشا چاوی کوێر بووە و دەڵێن: دەبێ شیری شێری لەمەشکێ شێری لەپشتی شێری ببەسترێ و بیخوا، ئەوجا چاك دەبێتەوە. دێڵە شێرەکە گوتی: مادام وایە ئەوە بەچکەکانم لەشوێنی جاران یاریدەکەن، بڕۆ پێیان بڵێ: داکتان مردووە ئەوەی گریا، ئەویان بێنەوە.

بەڵێ، شێرەکە چیگوت، ئەحمەد جێبەجێیکرد و ئەو بەچکەیەی گریا، هێنایەوە، ئەوجا

شێرەکە گوتی: ئەحمەد وەرە سەری ببڕە و بیکە بەمەشکە و لەنێو قەدێرا بیبەستە. بەئەمری خوای ئەو دێڵە شێرەش گوانێکیانی دەرمان بوو ئەوی دیکەیان دەرد بوو، گوتی:



www.iqra.ahlamontada.com

ئەحمەد هەرلایەی لەیەکیان پڕکە، یەکیان دەرمانە، یەکیان دەردە. دوای ئەوەی ئەحمەد هەردوولای مەشکەکەی پڕکرد لەشیر و لەپشتی شێرەکەی خۆی بەست ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ. بەڵام پێش ئەوەی بگاتەوە ماڵێ، لەلاخرێکیدا تووشی هەردوو زاوایەکەی پاشای دەبێت، تەماشا دەکات ئەوە (پندە بەگوولە[1]) یەکیان لە(دوڕنە)[2]یەکی کردووە، ئەو دەڵێ ئەوەتا و ئەو دەڵێ ئەوەتا، ئەحمەدیش لێیان دەچێتە پێشێ و دەڵێ: ئەوە چییە؟

ئەوانیش دەڵێن: ئەوە شێرە و دەمانەوێ بیگرین. ئەحمەد پێیان پێ دەکەنێ و دەڵێ: ئەوە کوا شێرە، ئەوە چۆلەکەش نییە، ئەوجا هەردوو زاوای پاشا دەکەونە قسە و پرسیار لە ئەحمەد و دەڵێن: خەڵکی کوێی و بۆ کوێ دەچی؟

ئەویش دەڵێ: خەڵکی ڕۆژهەڵاتم و دەچمە ڕۆژئاوا، دوایی دەڵێن: ئەی ئەوە چییە پێتە؟

ئەحمەدیش دەڵێ: ئەوە شیری شێرییە و لەمەشکەی شێریشم کردووە و لەپشتی ئەو شێرەشم بەستووە، هەردوو زاوای پاشای

---

١- پندە بەگوولە: فندەگولە، فندەبەگوولە، فند. جۆرە باڵندەیکی زۆر بچووکە، کە ڕەنگە بچووکترین باڵندەبێ.

٢ - دوڕنە: درووی بە یەکداچووی زۆر و چڕوپڕ.



www.iqra.ahlamontada.com

سەیری یەکدیدەکەن و دەڵێن: پێمان نافرۆشی، چەندی دەڵێی دەتدەینێ؟

ئەحمەدیش دەڵێ: نەوەڵلاّ نایفرۆشم، بەڵام دەتوانم هەندێکتان بەشەرت بدەمێ، ئەوانیش دەڵێن: چۆن؟

ئەویش دەڵێ: بەو شەرتەی هەر یەکەتان مۆرێکتان لەسمتی دەدەم بەو ئەنگوستیلەیەی لەدەستم دایە. هەر چەندە لەپێشەوە ڕازی نابن، بەڵام لەدوایدا بۆی ناچاردەبن. هەربۆیە ئەحمەدیش لەئەسپەکەی دادەبەزێ و سمتی هەردووکیان مۆردەکا و ئەو لایەیان بۆ لێدەکاتەوە کەدەردەکە بوو و بەڕێیان دەکا، ئەوجا ئەحمەد دەڕوا تادەگاتەوە کن بارگینە پشت کرمێیەکەی، ئەسپەکەی خۆی بەرەڵادەکات و خۆی دەکاتەوە بە کوڕە کەچەڵەی جاران و سواری بارگینەکەی دەبێ و دێتەوە بۆ ماڵێ.

هەردوو زاوای پاشای دوای ئەوەی دەگەنەوە ماڵێ، بەپەلە شیرەکەی بۆ پاشای خەزووریان دەبەن، بەڵام پاشا کەدەیخوا پێی خراپتر دەبێ، وەختێکی کوڕە کەچەڵیش دەڕواتەوە بۆ ماڵێ بە ژنەکەی دەڵێ: شۆربایەکم بەو شیرەی بۆ لێنێ، ژنەش دەڵێ: باشە. بۆ ئێوارێ کوڕە کەچەڵە بەژنەکەی دەڵێ: بۆ قاپێکی شۆربای بۆ بابت نابەی، ئەویش خێرا هەڵدەستێ قاپێکی بۆ دەبا و پاشاش دەیخوا. دوای ئەوەی کە پاشا شیرەکەی خوارد، وردە وردە



www.iqra.ahlamontada.com

هەستدەکا چاوەکانی چاکدەبنەوە، بۆیە فەرمان دەدا تەنەکە گەنمێك و تەنەکە زوڕاتێکیان بدەنێ.

بەڵێ کچە تەنەکە زوڕاتەکە و تەنەکە گەنمەکە دەباتەوە و بەکوڕە کەچەڵە دەڵێ: بابم چاوی بەو شۆربایەی چاکبۆتەوە، ئەوە سرِێکی تێدایە! ئەوجا دەڵێ: دەزانی ئەتۆ شتێکت لەمن شاردۆتەوە! ئەویش دەڵێ چم لێشاردوویەوە؟ کچەش دەڵێ : ئەمن بۆیە مێردم بە ئەتۆ کرد، چونکە ئەودەمی لەناو باخەکەی بەرامبەر ماڵێمان چاوم پێکەوتی، ئەتۆ ئەو کوڕە کەچەڵە نەبووی، ئەحمەدیش دەڵێ: من هەر کوڕە کەچەڵەم و کەسی دیکەش نیم. هەتا ڕۆژێکی دەڵێ: واچاکە خۆمیان لێئاشکراکەم، هەربۆیە هەڵدەستێ دەچێتە دەری شاری و لەوێ مووی ئەسپەکە و تاژییەکە و شێرەکەی هەڵدەپرِوزێنێ و وەکو سوارچاکێکی چالاك دەچێتە بەردەمی ماڵی پاشای. لەوێ نۆکەر لێی خرِدەبنەوە و پێی دەڵێن: دابەزە، ئەویش دەڵێ: دانابەزم، دوو پیاوم لێ ونبوون و هاتوونە ئێرە.

بەڵێ خەبەریان بۆ پاشای برد، سوارێك لەو حاڵە و لەو ڕەنگەی هاتووە و دەڵێ دوو پیاوم لێونبووە و هاتوونە ئێرە؟! هەربۆیە پاشا جارِدەدا و خەڵکی مەملەکەتەکەی خۆی هەمووی خرِدەکاتەوە، بەڵام ئەحمەد دەڵێ: ئەوانە هیچیان پیاوی من نین، پاشاش دەڵێ: کێ ماوە بیانهێنن؟ خەڵکەکەش دەڵێن: تەنها هەردوو کوڕەکانی



www.iqra.ahlamontada.com

وەزیری ماون. پاشا دەڵێ: ئـەوانیش بێـنن. کـەدەیانهێنن، یەکسـەر دەشڵەژێن،

ئەحمەدیش دەڵێ: ئەوانەن. خەڵکەکە سەریان سوڕدەمێنێ ودەڵێن ئـەو کابرایـە تێکـچووە. ئەوانـە کـوڕە وەزیـرن و زاوای پاشـان؟!
ئەحمەدیش دەڵێ: ئەو دوو پیاوەی مـن هـەر یەکـەیان مۆرێکی ئـەو ئەنگوسـتیلەیەی دەسـتم بەسمتیانەوەیـە، تەماشـایانکەن، ئەگـەر وانەبوو، دیـارە ئـی مـن نـین و ئامـادەی جەزایەکـەیم. دوای ئـەوەی تەماشایان دەکەن، قسەکەی ڕاست دەردەچێ، ئەوجا
ئەحـمـەد بەپاشـای دەڵـێ: پاشـا ئەگـەر قبوڵکـەی ئـەمن کـوڕە کەچەڵەم و زاوای تۆم، ئەوجا پاشا لەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە بۆ نـاو کۆشـکەکەی و دەیکـا بەسەرلەشـکری خـۆی و پـەنجا نۆکـەریش بـۆ خزمەتکردنی دیاریدەکا.

ڕۆژێکی بەهارێ ئەحمەد بەنۆکەرەکانی دەڵـێ: بـەیانی دەچـین بـۆ ڕاوشکارێ، ئەوانیش دەڵێن باشە و خۆیان حازر دەکەن، بۆ سبەینێ ئەحمـەد و نۆکـەرەکانی ڕوو لـەکێوێکی دەکـەن. لـەوێ تووشـی مامزێکی دەبن و چواردەوری دەگرن.

ئەحمەد بەنۆکەرەکانی دەڵـێ: هەرچـی ئـەو مـامزەی بـەلادا بـڕوا و لێـی ڕەتـبێ، لەسـەری دەدەم، ئەگـەر بـەلای منیـشدا ڕەتبـوو، تـا نـــەیگرم وازی لێنـــاهێنم. ئـــەوەبوو چـــواردەوری مامزەکـــەیان



www.iqra.ahlamontada.com

تەسککردەوە تا لەپڕ بەلای ئەحمەددا ڕەتبوو و ئەحمەدیش دوای دەکەوێ تادەگاتە قەڵایەکی، لەو قەڵایەیدا پیرێژنێکی لێدەبێ، دێتە دەرێ و بەئەحمەدی دەڵێ:

چییە ئەحمەد، لێرەش واز لەکچەکەم ناهێنی؟

ئەحمەدیش دەڵێ: نەمزانیوە کچی تۆیە، وام زانیوە مامزە بۆیە دوایکەوتووم! ئەوجا دەگەڕێتەوە دواوە. بەڵام پیرێژنەکە دەڵێ: مادام هاتووی نابێ ئەوشەو بڕۆی، دەبێ میوانی من بی و دامەیەکم لەگەڵ بکەی. ئەگەر من بردمەوە، دەتکوژم، ئەگەر تۆش بردتەوە، کچەکەمت دەدەمێ.

بەڵێ بەو شەرتەی ڕێکەوتن و شەوێ دەستیان بەدامەکردنێ کرد. کچێ پیرێژنێ ئەوەندەی دەور و خوولی ئەحمەدیدا، تا دامەکەی پێدۆڕاند، پیرێژنیش شوویەکی[1] لەسەری ئەحمەد و ئەسپەکەی و تاژییەکەی دا و کردنی بەبەرد و وشکی کردن.

دوای ئەوەی ئەحمەد وای بەسەر دێ، ڕۆژێکی مەحموودی برای لەکۆشکێ دێتە دەرێ و تەماشادەکا نەمامی ئەحمەدی برای وردەوردە بەرەو سیسبوون و وشکبوون دەچێ، لەبەر خۆیەوە دەڵێ: دیارە ئەحمەدی برام نەماوە، واچاکە سۆراغێکی بکەم.

---

١- شوو: شووڵ، پەل و لقی باریکی درەخت. کە زیاتر بۆ دروستکردنی سەبەتە و شتی ناوماڵ بەکاردەهێنرێت.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵێ مەحموود بەهەمان ڕێگای ئەحمەدی برایدا دەڕوات تادەگاتە ئەو تەپۆلکەکەیەی کەئەحمەدی برای لەسەری دانیشتبوو. ئەویش لەسەری دادەنیشێ و ئیسراحەت دەکا، ئەوجا تەپۆلکەکە بەدەستوری ئەحمەدی برای لێی دێتە قسە و نەسیحەتی دەکا و دەڵێ: بەو شەرتەی ئەگەر گەڕایەوە دەبێ گومەزێکم لەسەرکەی، دەنا وەکو ئەحمەدی برات ڕێت لێون دەکەم. مەحموودیش دەڵێ: زۆر باشە. ئەوجا تەپۆلکەکە بەمەحموودی دەڵێ: بچۆ بۆ ناو ئەو غارەی لەوێ ئەسپێك و تاژییەك و زێڕێکی زۆر لەگەڵ خۆت ببە، لەوێ دێڵە شێرێکی لێیە، بۆ ئەوەی بەچکەیەکی دیکەت بداتێ، پێی بڵێ: بەچکە شێرەکەم مردووە. خۆت تێکمەدە؟ چونکە ئەو وادەزانێ کە ئەتۆ هەر ئەحمەدی، دوایی بڕۆوە بۆ ماڵێ و هەرچیت تووش بوو بۆی باس بکە. جا بۆ ئەوەی بتبەنەوە بۆ ماڵی ئەحمەدی برات، بڵێ : ئەوەندە ماندووبووم، ماڵی خۆم پێ نازانمەوە. شەوێش ئەگەر براژنت دەور و خوولی دای، بڵێ ئەوشەو لێمگەڕێ زۆر ماندووم، بەیانیش بەنۆکەرەکانت بڵێ: ئەوڕۆش ڕاوە لەجێی دوێنێ، لەوێ تووشی مامزێکی دەبن و بڵێ: ئەوەی بەلایدا ڕەتبێت لەسەری دەدەم، ئەگەر بەلای منیشدا ڕەتبوو، تا نەیگرم وازی لێناهێنم، ئەگەر مامزەکە بەلاتدا ڕەتبوو دوایکەوە دەتباتە ئەو جێگایەی ئەحمەدی براتی لێکراوە بەبەرد.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵێ مەحموود هەموو ئەو نەسیحەتانەی تەپۆلکەکەی لەگوێ گرت و یەك بەیەکی لەشوێن و جێگای خۆیدا جێبەجێکردن، تاگەیشتە ئەو جێگایەی مامزەکە بەلایدا ڕەتبوو، ئەوجا دوایکەوت تاگەیشتە ئەو غارەی تەپۆلکەکە باسیکرد. لەوێ چاوی بەپیرێژنێ کەوت و پیرێژن گوتی: تۆش هاتووی وەك ئەحمەدی برات خۆت بفەوتێنی، یان دوای کچەکەم کەوتووی؟! مەحموودیش دەڵێ: نەمزانیوە کچی تۆیە، وامزانیوە مامزە، مادام وایە من دەڕۆم، بەڵام پیرێژن دەڵێ: مادام هاتووی دەبێ ئەوشەو میوانی من بی و دامەیەکیشم لەگەڵدا بکەی، ئەمن لەسەر سەر و ئەتۆش لەسەر کچ. ئەوجا مەحموود بەقسەی دەکا و دەمێنێتەوە. بۆ شەوێ دامەی لەگەڵدا دەکا و کچەکەشی هەر دەور و خولی مەحموودی دەدا، بۆئەوەی یارییەکەی پێبدۆڕێنێ، بەڵام مەحموود وریا دەبێ، دەزانێ کچەکەی دەیەوێ فێڵی لێبکا، بۆیە مستێکی لەدەمی دەدا و ناو زاری پڕدەکا لەخوێن، ئەوجا یارییەکەی دەباتەوە و کچەکەی لێدەستێنێ، ئەوجارەیان پیرێژن دەڵێ: با لەسەر سەر، یاری بکەین، هەرچی بردیەوە ئەوی کە بکوژێ، مەحموودیش دەڵێ: باشە و یاریدەکەن و یارییەکەش دەباتەوە، ئەوجا کچەکە دەڵێ: مادام وایە، وەرە داکم بکوژە و جەرگ و دڵەکەی دەربێنە و هەڵیان کزێنە، ئەگەر کەفی کرد هەر



www.iqra.ahlamontada.com

بلْقێکی لەهەر بەردێکی بدەی دەبێتەوە بەزیندەوەری جاران، ئنجا هەرچی بێ، بەشەر بێ، یان حەیوان.

بەڵێ ئەوجا مەحموود هەڵدەستێ پیرێژنەکەی دەکوژێ و جەرگ و دڵەکەی دەردێنێ و دەیخاتە سەر سێڵە[1] و لەسەر ئاگریان دادەنێ تا بلْق و کەفی دەکەن، ئەوجا کەفی لەهەر بەردێکی دەدا دەبێتەوە بەزیندەوەری جاران، ئەوجا کچەکە ئەو بەردەی نیشانی مەحموودی دەدا کەئەحمەدی برایەتی، ئەوانیش چاکدەکاتەوە و کچەش لەگەڵ خۆیاندا دەهێننەوە و دەڕۆنەوە بۆ ماڵێ، ئەوجا ئەحمەد و مەحموود هەردوو ژنەکانیان پێکەوە دەڕۆنەوە بەرەو مەملەکەتی خۆیان، بەلاّم پێش ئەوەی بگەنەوە ماڵێ،مەحموود دەڵێ: من نایەمەوە هەتا گومەزێکی لەسەر ئەو تەپۆلکەیەی دروستنەکەم، بەئەحمەدی برای دەڵێت: بڕۆ نۆکەر و کەرەسەی بیناسازیم بۆ بنێرە، تا ئەو گومەزەی دروست نەکەم نایەمەوە.

بەڵێ مەحموود گومەزی دروستکرد و گەڕایەوە بۆ ماڵێ، ئەوجا هەموو لایەك بەیەکدی شادبوونەوە و ئەمنیش هاتمەوە و هیچیان نەدامێ.

---

١ -سێڵە : ساجی نان برژاندن.



www.iqra.ahlamontada.com

# خاڵ و خوارزا[1]

هەبوو نەبوو کەس لەخوای گەورەتر نەبوو، خاڵ و خوارزایەك دەبن زۆر وریـا و زۆرزان دەبـن. ڕۆژێـك لـە ڕۆژان پێکـەوە لـەبن دارێکـی دادەنیـشن و پێکـەوە قـسان دەکـەن، هێلانـە قـەلێکیش لەسـەر دارەکەی دەبێت.

خاڵ دەڵێ: چاوت لێبـێ خـوارزا ئێـستا چـۆن هێلکـەی لـەو قەلـەی دەدزم. خـاڵ بەدارەکەیـدا سـەردەکەوێ، لـەو دەمەشـدا کـەخاڵ بەدارەکەیدا هەڵدەگەڕا، خوارزاش خەریکی فێڵێکی کە بوو. ئەوەبوو تاخـاڵ هێلکـەی لەقـەلی دزی، خـوارزاش لـەخوارێڕا پـانتۆڵی لـەپێی خاڵی دانا.

وەختێکـی خـاڵ دێتـە خـوارێ بـەخوارزای دەڵێـت: چـاوت لێبـوو نەمهێشت پێ بزانێ و هێلکەم لەبن دەرهێنا.

خوارزاش دەڵێ: بەڵام من لەتۆ ئازاتر و دزتربووم.

خاڵ دەڵێ: چۆن؟

---

١- ئـەم چـیرۆکە بەشـێوازێکی کـورتر لەدەستنووسـی کتێبـی (کۆمـەڵێك چـیرۆکی فۆلکلۆریی پەندئامێز) کۆکرابۆوە، کـە لەکۆکردنـەوەی (مامۆسـتا سـەلام مـەنمی)یـە، بەڵام لێرە بەشێوازێکی باشتر هەبوو، لەبەرئەوە، ئەمەمان هەڵبژارد.



www.iqra.ahlamontada.com

خوارزاش دەڵێ: خۆت دیوە، چۆنم ڕووتکردوویەوە!

ئەوجا خاڵ دەڵێ: مادام وایە بۆ نەچین خەزنەی پاشای ببڕین؟!

بەڵێ هەردوولا ڕێکدەکەون و بۆ شەوێ خەزنەی پاشای دەدزن. خەبەر بۆ پاشای دەچێ و دەڵێن: پاشا خەزنەکەیان بڕیوی. ئەویش ئەمر دەردەکا و دەڵێ: بچن هەر چواردەورەی قەڵایەکەم بۆ بکەن بەخەندەك و قیل و زفتی تێکەن.

خاڵ و خوارزاش لەخۆشی ئەو هەموو زێڕەی دزیویانە ئاگایان لەو کارەی پاشا نابێ، هەربۆیە بۆ شەوی دوایی ڕوودەکەنەوە قەڵا بۆ ئەوەی جارێکی کەش خەزنەی پاشای ببڕنەوە، لەکاتی چوونیان بۆ قەڵا خاڵ لەپێشەوە دەبێت و دەکەوێتە ناو قیل و زفتەکەی، خوارزاش هەرچەند هەوڵدەدات خاڵی بۆ دەرنایەتەوە. بۆیە بە ناچاری خاڵی دەڵێ:

ڕۆڵە تازە من چووم، بەڵام تۆ شتێك بکە ئاشکرانەبی. خوارزا دەڵێ: چۆن، چی بکەم؟

خاڵ دەڵێ: وەرە سەرم ببڕە، ئەگەر سەرم پێوە نەبێ، کەس نازانێ ئەو لاشەیە ئی کێیە؟

خوارزاش دەڵێ باشە، بەڵام پێش ئەوەی سەری خاڵی ببڕێ، پێ لەسەر شانی خاڵی دادەنێ و دەچێ دوو کۆڵی دیکەش زێڕ و زیو دێنێ، پاشان سەری خاڵی دەبڕێ و دە توورەکەی دەهاوێ و



www.iqra.ahlamontada.com

دەیباتەوە بۆ ماڵێ. وەختێکی خاڵۆژنی چاوی بەخوارزای دەکەوێ کە بەتەنێیە، دەڵێ: ڕۆڵە کوا خاڵت؟

خوارزاش دەڵێ: خاڵۆژن قسان مەکە تازە خاڵم ڕۆی، دەبێ شتێکی وا بکەین ئێمەش ئاشکرا نەبین، دەنا پاشا دەمان کوژێ.

بۆ سبەینێ کەڕۆژ هەڵدێ، نۆکەری پاشای جەنازەیەکی بێ سەر لەناو ئەو خەندەکەکەی لێیانداوە، دەبینێت.

خەبەر بۆ پاشای دەبەن و دەڵێن: پاشا ئەو شەو دزێك هاتووە دوو کۆڵی دیکەی زێڕ بردووە، بەڵام جەنازەیەکی بێسەر لەناو قیل و زفتەکەیدا بەجێماوە.

پاشا دەڵێ: بڕۆن ئەو جەنازەیەی بێننە دەرێ و بیبەن لەو دەشتەی لەچۆڵەوانییەکی دانێن و حەرەسیاتی لێ بگرن، ئەو جەنازەیە بێساحێب نییە، ئەوجا نۆکەری پاشای فەرمانی پاشای جێبەجێدەکەن و جەنازەی خاڵی دەبەنە چۆڵەوانییەکی و حەرەسیاتی لێدەگرن.

وەختێکی خوارزا بەو خەبەرەی دەزانێ، دەڵێ: خاڵۆژن ئەوشەو جەنازەی خاڵم دەدزمەوە، بەڵام ئەتۆ ئەوشەو دەرگای حەوشەی دامەخە، ئەگەر کەرەکە هاتەوە، دایکە و دەرگای حەوشەی جوان داخەوە. بۆ شەوێ خوارزا دەفەیەکی بەشانیدا دەکا و سواری ماکەرە تازە زاوەکەی دەبێ و دەڕوا، بەڵام جاشەکەرەکەی لەماڵێ



www.iqra.ahlamontada.com

بەجێدێڵێ. ئەوجا خوارزا بەدەفە لێدان و زیکرکردنەوە، بەنزیک ئەو شوێنەیدا دەڕوا کەجەنازەی خاڵی و حەرەسەکانی پاشای لێیە. وەختێکی حەرەسەکان گوێیان لەدەفەکەی دەبێ، بانگی دەکەن. بەڵام خوارزاکە خۆی وەك دەروێشێك لێکردووە دەڵێ: نایەم ئەوە دەتانەوێ کەرەکەم لێبدزن؟

ئەوانیش دەڵێن: وەرە ئەوشەو دەفەمان بۆ لێدە، هەرچیشت دەوێ دەتدەینێ.

خوارزاش هەرچەندە زۆری پێخۆش دەبێ، بەڵام دەڵێ: ئەی ئەگەر کەرەکەیان دزیم.

ئەوانیش دەڵێن: کەس نایدزێ، ئەگەر دزیان، بۆت دەبژێرین.

ئەو شەوە خوارزا ئەوەندەی دەفە بۆ لێدان هەتا هەموویان خەویان لێکەوت، ئەوجا هەستا جەنازەی خاڵی لە کەرەکەی بارکرد و بەڕێی کردەوە بۆ ماڵێ و بۆ خۆشی سەری بەدەفەکەی کرد و خەوی لێکەوت.

بۆ سبەینێ وەختێکی بەخەبەردێن، تەماشا دەکەن نەکەر ماوە و نەجەنازە!

خوارزاش دەڵێ: سەگبابینە نەمگوت کەرەکەم لێدەدزن، بۆ ئەو فێڵەی منتان بانگکرد، وەڵڵاهی بۆم نەبژێرن دەچم شکاتتان لەکن پاشای لێدەکەم.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوانیش لەترسان، چونکە لەلایەکی جەنازە نەماوە و لەلایەکی کەش کەری دەرویشی دزراوە، بۆی دەبژێرن.
ئەوجا خوارزا دێتەوە بۆ ماڵێ و هەر لەحەوشەی جەنازەی خاڵی دەشارێتەوە و بەخاڵۆژنی دەڵێ: نابێ کەس بەو مەسەلەیەی بزانێ.
ئەوجا خەبەر دەگاتە پاشای ودەڵێن:
پاشا، کابرا جەنازەکەشی دزیوەتەوە، پیاوەکانیشت پێیان نەگیرا.
ئەوجا پاشا ئەمر دەردەکا سەر و سمێڵیان بتاشن و دەریانکەن لەو مەملەکەتەی.
پاشان هەموو پیاوماقووڵانی مەملەکەتەکەی خڕدەکاتەوە و پێیان دەڵێ:
ئەو کابرایە زۆر بە تەماحە، حوشترێکی بێنن بارێك زێڕی لێبارکەن و بەناو شاریدا بەرەڵایکەن. لە هەموو سووچ و کۆڵانێکیش حەرەسیاتی لێبگرن، بەو شێوەیە دەتوانن کابرای دز بگرن.
وەختێکی خوارزا بەو مەسەلەیە دەزانێ، بەخاڵۆژنی دەڵێ: دەرگای حەوشەی دامەخە، دەچم بارێك قەرسیلی[1] دێنم بۆ ئەوەی ئەگەر کەرەکە هاتەوە، یەکسەر بێتە ژووری.
خاڵۆژنیشی دەڵێ: باشە.

---

١ – قەرسیل: گەنم و جۆ کەهێشتا گوڵی نەکردبێ.



www.iqra.ahlamontada.com

خوارزا دەڕوا بارێکی قەرسیل لەکەرەکەی باردەکا و دێتەوە بۆ ناو شاری، بەڵام پێش ئەوەی بگاتەوە لە دەری شاری،شەڕە سەیەکی سازدەکا. هەرچی خەڵکی ئەو شارەی هەیە دەچنە سەیری و کەس ئاگای لە کەس نامێنێ، ئەویش دێتەوە، وەختێکی چاوی بەحوشترەکەی دەکەوێ، وردەوردە قەرسیلی بۆ بەردەداتەوە بۆ ئەوەی دوای کەوێ تادەگاتەوە ماڵێ.

ئەوجا حوشترەکەی دادەکا و بەخاڵۆژنی دەڵێ: بیبەستەوە.

وەختێکی شەڕە سە تەواوبوو، هەر کەسە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، خوارزاش هاتەوە ماڵێ و سەری حوشترەکەی بڕی و گۆشتەکەی هەڵگرت.

ئەوجا خەبەریان بۆ پاشای برد و گوتیان: وەڵڵا بابە حوشتریش بەبار و زێڕەوە نەما.

پاشا بەوەی زۆر خەفەتی خوارد و ئەوجا هەموو خەڵکی مەملەکەتەکەی خڕکردەوە و گوتی: هەرچی بتوانێ حوشترەکەم بۆ بدۆزێتەوە، بەکێشی خۆی زێڕی دەدەمێ.

لە ناو هەمەواندا پیرێژنێکی هەڵیدایە و گوتی:

ئەمن بە نانە ڕەقیش ڕازیم و بۆشت دەدۆزمەوە. تومەز پیرێژن پێشتر چاوی لێبووە کەحوشترەکە ڕووی لە ماڵی کەسێك کردووە و دیارنەماوە. بۆیە ڕوو لەو ماڵەی دەکا و بەبێنووی ئەوەی



www.iqra.ahlamontada.com

دەستکورتە و هەتیوی هەیە، داوای یارمەتی و پێدانی هەندێ گۆشت لەژنی ئەو ماڵەی دەکا کەئەویش ماڵی خوارزایە. هەربۆیە خاڵۆژنیش بەزەیی پێدا دێتەوە، هەڵدەستێ هەندێك گۆشتی حوشترەکەی بۆی دێنێ، ئنجا پیرێژن هەڵدەستێ و دەڕوا.

بەڵام خوارزا لەو وەختەیدا دێتەوە و لە بەردەرگای دەرێ تووشی پیرێژنێ دەبێ و لێی دەپرسێت: ئەوە چییە پێتە پورێ؟

ئەویش دەڵێ: وەڵڵا تۆزێك گۆشتە دەیبەمەوە بۆ منداڵەکانم، خاڵۆژنت دایمێ.

خوارزاش لەفێڵەکەی دەگا ودەڵێت: ئنجا ئەوەندە چییە، وەرە با هەندێکی کەت دەمێ. بەو بێنوەی دەیگێڕێتەوە بۆ حەوشەی و هەر لەوێش سەری پیرێژنێ دەبڕێ و دەیشارێتەوە. بەخاڵۆژنیشی دەڵێ: ئەتۆ چۆن گۆشتی حوشترەکەی زایەدەکەی[1]، نازانی ئەوە فێڵی پاشایە، خۆئەگەر ئێستا نەدەهاتمەوە ئەوە تائێواری پاشا هەردووکمانی لەسێدارەدەدا.

وەختێکی یاساوڵی پاشای بەنیازی خەبەرێك دەچنە ماڵی پیرێژنێ، کەسیان دەستناکەوێت سۆراغێکیان بۆ بکا، ئنجا دوای گەڕانێکی زۆر و پرسیارکردن، بۆیان دەردەکەوێ کەپیرێژنیش دیارنەماوە. ئەوجا خەبەردەدەنە پاشای ودەڵێن:

---

١- زایەکردن: لەکیسدان، پێدانی شتێك بە کەسێك.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا پیرێژنیش تۆ خۆش!

پاشا بەو وەزعەی زۆر سەرسام دەبێ، هەموو داروودەستەکەی کۆدەکاتەوە، لێیان دەپرسێ:

تەگبیر چییە؟

ئەوجا یەکێك لەناو هەمووواندا ڕاست دەبێتەوە و دەڵێ: پاشا ئەگەر لێم قبوڵ بکەی ئەتۆ کچێکی جوانت هەیە، بیبە لەو دەشتەی خێمەیەکی بۆ هەڵدەن و حەرەسیاتی لێبگرن، ئەو کابرایە زۆر بەتەماح و چاوچنۆکە، ئەو کارەش دەکا، ئەگەر هاتیش، باکچەکە هاوارکا و ئەوجا حەرەسەکان دەتوانن بیگرن.

هەرچی ئەم پیاوە گوتی، پاشا بڕیاریدا جێبەجێ بکرێ، خوارزاش کەدەزانێ تەگبیرێکی وا هەیە، تەماح دەیگرێ و مری لێخۆش دەکا، لەو مەملەکەتەشدا کابرایەکی جوولەکە دەبێ، ئیشی ئەو کابرایەش خمکردن[1] دەبێت.

هەربۆیە بۆ شەوێ خوارزا دەچێتەماڵی جوولەکەی و پێی دەڵێ:

ئەو گوریسەم بۆ (خم) کەوە، هەرچەند جوولەکە دەڵێ: بەو شەوەی ناتوانم، بەڵام خوارزا بەتەماحی پارە دڵی نەرم دەکا و ئیشەکەی پێدەکا.

---

١- خمکردن: ڕەنگکردنەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

دوای ئـەوەی کـابرای جوولەکـە گوریسەکەی بۆ خمدەکا، خـوارزا دەڵێ:

کابرا دەست درێژکە تا پارەکەت دەمێ، ئـەویش لـە(دەلاقـە)ی ڕا دەستی درێژ دەکا، بەڵام خوارزا لەجیاتی ئەوەی پـارەی بداتێ، بـە شیرێکی دەستی لەبندا دەبڕێ و دەسـتە بڕاوەکـەی دەپێـچێتەوە و لەگەڵ خۆی دەباتەوە بۆ ماڵێ، ئنجا بەنهێنی خۆی دەگەیەنێتە ئـەو جێگایەی کچێ پاشای لێیە و بەقسەی خـۆش هـەڵی دەخەڵـەتێنێ و هەموو شتێکی لەگەڵدا دەکا.

دوای ئـەوەی خـوارزا لەهـەموو دەسـت بازییـەکی دەبێتـەوە، بـۆ ئەوەی خـۆی بدزێتـەوە، بەکـچێ پاشـای دەڵـێ: ئـەو پەتـەی بگـرە سەرێکی با بەدەستی تۆوە بـێ و سـەرەکەی کـەش لەدەسـتی منـی ببەستە، دەچم دەستێکی بەئاو دەگەیەنم ئەوجا هاوارکە. وەختێکی هەندێك لەکچەکەی پاشـای دوور دەکەوێتـەوە، پەتەکـەی لەدەسـتی خۆی دەکاتەوە و لەدەستە بڕاوەکەی کابرای جوولەکـەی دەبەسـتێ و ئەوجا بەئەسپایی خۆی دەدزێتەوە.

ئەوجا کچێ پاشای پەتەکەی ڕادەکێشێ و هاواردەکا: فریام کەون، کەچی لەجیاتی دەستی خوارزای دەستی بـڕاوی کـابرای جوولەکـەی بەدەستەوە دێ.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵێ ئەوجارەش خوارزا نەگیرا و خەبەری بۆ پاشای دەبەن و دەڵێن: کابرا خۆی گەیاندۆتە کچەکە، کچەکەشت توانیویەتی دەستێکی ببڕێ. ئەوجا پیاوماقوڵانی پاشا خڕدەبنەوە ودەڵێن: مادام وایە بێنن هەرچی پیاوی ئەو مەملەکەتەی هەیە کۆیکەنەوە، هەرچی دەستی بڕابێ، ئەوە ئەو هەموو کەتنانەی کردووە.

بەڵێ هەرچی پیاوی ئەو مەملەکەتەی بوو کۆیانکردەوە، کەس نەبوو دەستی بڕابێ و لەوەش بێئومێد بوون.

بۆ سبەینێ کابرای جوولەکە لەبەر دەستە بڕاوەکەی بۆ شکاتکردن دەچێتە ماڵی پاشای، بەڵام لەوێ دەیگرن و پیاوماقوڵان بانگدەکەن و پێیان دەڵێن: کابرای دەست بڕاومان گرتووە.

بەڵێ پیاوماقوڵ دێن و لەجوولەکەی خڕدەبنەوە پێی دەڵێن: ئەو دەستەت بۆ وایە؟

کابرای جوولەکەش دەڵێ: ئەوشەو کابرایەك هات و گوتی دەبێ هەرچۆنێکی بێ ئەوشەو ئەو گوریسەم بۆ خمکەی، ئەمنیش بۆم خمکرد. ئنجا گوتی: دەست درێژکە با حەقەکەت دەمێ، ئەمنیش دەستم درێژکرد، کەچی لەجیاتی حەقی خۆشم، ئاوا دەستی بڕیم و ڕۆی، ئێستاش نازانم کێ بوو؟!

ئەوجا پیاوماقوڵێك هەستایە سەر پێ و گوتی: پاشا جوولەکە ئەو شتەی لەدەست نایە، چاکتر وایە دەبێت چاوەڕێکەی تا کچەکە



www.iqra.ahlamontada.com

منداڵی دەبێ و ئەو منداڵە گەورەدەبێ و دوایی بەڕوحم بابی خۆی دەدۆزێتەوە.

ئەوجا پاشا گوتی: زۆر چاکە.

بەڵێ دوای ئەوەی کچە منداڵی دەبێ و منداڵەکەش دەبێتە سێ چوار ساڵان، پاشا هەرچی پیاوی ئەو مەملەکەتەی خۆی داوەت دەکا. خوارزاش پێش ئەوەی بچێتە ماڵی پاشای،دوو بەچکە پشیلەی دەخاتە بەر باخەڵی و دەڕوا لەسوچێکی بەبێ دەنگی دادەنیشێ.

دوای ئەوەی نان دەخورێ، پاشا منداڵەکەی لەناو پیاوان بەرەڵادەکات، ئەو منداڵەش بەناویاندا دەگەڕێ تادەگاتە بەردەمی خوارزای، خوارزاش هەر ئەگەر منداڵەکەی لێنزیك دەبێتەوە، بەچکە پشیلەکانی نیشان دەدا، ئەویش هەڵدێ بەلایەکی کەدا.

دوای ئەوەی ئەو کارە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە، ئەوجا خوارزا هەڵدەستێ منداڵەکەی لەباوەشێ دەکا و دەڵێ: پاشا هەرچی لەو شارەیدا کراوە، من کردوومە، ئنجا تۆش هەر بڕیارێکی دەردەکەی ملم کەچە... ئەوجا پاشا عەفووی دەکا و کچەکەی خۆی دەداتێ و دەیکاتە پیاوی دەستە ڕاستی خۆی و ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.



www.iqra.ahlamontada.com

# کوپەڵە زێڕ

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورەتر نەبوو، دەگێڕنەوە دەڵێن: لە مەملەکەتێکی پاشانشین و لەگوندێکی لاچەپەکی[1] ئەو مەملەکەتەیدا، کابرایەکی جووتیار دەبێ. ئەو جووتیارە ڕۆژێکی بەهارێ بۆ جووتی دەچێتە بناری شاخی و دەستدەکا بەجووتکردن بەگایەکانی. لەکاتی جووتکردندا، کوپەڵەیەکی دەدۆزێتەوە. وەختێکی تەماشای دەکا، دەبینێ زێڕێکی زۆری تێدایە. لەخۆشیان نازانێ چی بکا. هەڵدەستێتە سەر پێ و بەملاوئەولای خۆیدا دەڕوانێ تابزانێ کەس دیارنییە، وەختێکی تەماشا دەکا سوارێکی لەدوورەوە دیارە، لەدڵی خۆیدا دەڵێ:

واچاکە بانگی کەم و بەشیدەم دەنا خەبەری پاشام لێدەدا. هەربۆیە بانگی دەکا و دەڵێ:

کاکە وەرە بۆ ئێرە، ئیشێکم پێتە.

کابراش دەڵێ: باشە کاکە ئەوە دێم.

ئەوجا کابرای جووتیار جارێکی کە لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

بۆ بەشیدەم، کێ دەڵێ چاوی لێبووە؟!

---

١- لاچەپەك: شوێنی بەلاوە، پەنا.



www.iqra.ahlamontada.com

هەر بۆیە وەختێك کابرای سوار دێت پێی دەڵێ:

ئەرێ کاکە (گا ڕەش)م چاکترە یان (گا سوور).

ئەوجا کابرا سەرێکی بۆ دەلەقێنێ و دەڵێ: کاکە من چووزانم خۆ گای من نین و دەڕوا.

وەختێکی کابرای سوار دەڕوا، کابرای جووتیار دەکەوێتەوە دڵەڕاوکێ و دوای دەکەوێ و دەڵێ کاکە وەرە بگەڕێوە ئیشم پێتە.

ئەوجا کابرای سوار دەگەڕێتەوە، کەچی دیسان کابرای جووتیار لەبەر خۆیەوە دەڵێ: کوڕە وەڵلاهی بەشی نادەم، کێ دەڵێ دیویەتی؟

بۆیە وەختێکی کابرای سوار دەگەڕێتەوە پێی دەڵێ: ئەرێ کاکە زەوی بەر[1] (ڕێ) یەم چاکترە، یان سەر (ڕێ)یە؟

بەو قسەیەی کابرای زۆر تووڕەدەبێ و یەکسەر دەڕوا. ئەوجا کابرای جووتیار تینی بۆ دێ؟ چونکە هەرچەند بانگی کابرای سوارە دەکا، جوابی ناداتەوە. هەر بۆیە خێرا هەڵدەستێ کوپەڵە زێڕەکەی دەخاتە ناو سەرشیرەکەی[2] و دەڕواتەوە بۆ ماڵێ، لەماڵێش تا گایەکانی دادەکا و تفاق و ئاویان دەداتێ، ژنەکەی لەبەر خۆیەوە

---

١- بەر: خوار. بەرەوە: خوارەوە.

٢- سەرشیر: پارچە قوماشێکە بۆ داپۆشینی شیر لەکاتی هەوێنکردندا بەکاردەهێنرێت، یان هەندێ جار نان و خواردنی تێدا هەڵدەگیرێت.



www.iqra.ahlamontada.com

دەڵێ: شتێك هەیە ئەو پیاوە بەو زووەی هاتۆتەوە، بۆیە دەچێ پرێسکەکەی[1] دەکاتەوە و دەبینێ ئەوە کوپەڵە زێڕێکی تێدایە! ئەوجا بەبێ دەنگی کوپەڵە زێڕەکەی دەردێنێ و بەردێکی بەقەد کوپەڵەکەی بۆ دەخاتەوە ناو سەرشیرەکەی.

وەختێك کابرای جووتیار گایەکانی دابین دەکا، دەست دەداتە پرێسکەکەی، یەکسەر دەڕوا بۆ ماڵی پاشای، لەوێش نۆکەرەکانی پاشا لێی دەپرسن: ئەوە چییە پێت؟

کابراش دەڵێ: دیاریم بۆ پاشای هێناوە.

ئەوجا نۆکەرەکان خەبەر دەدەنە پاشای و دەڵێن: پاشا کابرایەك هاتووە و شتێکی بەدەستەوەیە و دەڵێ: دیاریم بۆ پاشای هێناوە.

پاشاش دەڵێ: با بێتە ژوورێ.

ئەوجا کابرا دەچێتە ژوورێ و پرێسکەکەی لەبەردەمی پاشای دادەنێ.

پاشا لێی دەپرسێ: ئەوە چییە؟

کابراش دەڵێ: پاشا پرێسکەکە دەزانێت.

ئەوجا پاشا ئەمر دەکا و دەڵێ: ئەو پرێسکەیەی بکەنەوە بزانن چی تێدایە؟

---

١- پرێسکە: ئەو کەلوپەل و خواردنەی دەپێچرێتەوە بۆ کەژ و کێو ئنجا توورەکە بێت یان هەرشتێکی تر.



www.iqra.ahlamontada.com

وەختێکی دەیکەنەوە، تەماشا دەکەن ئەوە بەردێکی گەورەی تێدایە!

پاشا دەڵێ: ئەوە چییە کابرا؟

کابرای جووتیاریش واقی وڕدەمێنێ و ماوەیەك وڕدەبێ.پاشان دەڵێ:

پاشا چت لێبشارمەوە، بەسەری تۆ ئەوە سێ ڕۆژە من لەگەڵ ژنی خۆم شەڕمە، من دەڵێم ئەو بەردە (٣) حۆقە[١] دەبێ، ئەو دەڵێ نابێ.

پاشا زۆر توڕە دەبێ و دەڵێ: بڕۆن بیبەن زیندانی بکەن، بەڵام چاودێرییەکی باشی بکەن، بەخۆڕایی نییە بۆ ئێرە هاتووە.

بەڵێ کابرای جووتیار دەبەنە زیندانێ و ماوەیەك چاودێرییەکی باشی دەکەن، وەختێکی تەماشای دەکەن کابرا لەبەر خۆیەوە قسان دەبزڕکێنێ و دەڵێ: خوایە ئەوەی من دۆزیمەوە و هێنامەوە کوپەڵە زێڕ بوو، زێڕەکانیش هەموویان خڕ و گچکە گچکە بوون، ئەی بۆچی بوو بەو بەردە گەورەیە!

ئنجا نۆکەرەکان خەبەر بۆ پاشای دەبەن و دەڵێن: پاشا ئەو کابرایە هەر لەبەر خۆیەوە قسان دەکات، پێدەچێ شتێکی دۆزیبێتەوە.

---

١- حۆقە: جۆرێك بووە لە پێوانە بۆ کێشانی شتومەك بەکارهاتووە.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوجا پاشا دەڵێ: بڕۆن بیهێنن.

وەختێکی دەیبەن بۆ لای پاشای و لێی دەپرسن: بۆچی بەهەردوو دەستت بازنەی گچکە گچکەت دروستدەکرد و پاشان هەردوو دەستت لێکدەدا و دەتکرد بەبازنەیەکی گەورە؟

کابرای جووتیاریش دەڵێ: وەڵڵا بڵێم چی،سەرم سوڕماوە!

ئەوانیش دەڵێن: لەچی؟

کابراش دەڵێ: سەرم لەوەی سوڕماوە، تەماشا دەکەم سەری پاشای ئەوەندە گەورەیە و... داکی پاشای ئەوەندە گچکەیە، چۆن تێوەی هاتووە؟

پاشا توڕەدەبێ و دەڵێ: بڕۆن بیبەن لەسەر قۆریە گیایەکی دابنێن و ئاگری تێبەردەن.

بەڵێ کابرای جووتیار دەبەن و دەست و لاقانی دەبەستن و هەڵیدەدەنە ناو قۆریە گیایەکی[1] و پاشان ئاگری تێبەردەدەن.

وەختێکی کابرای جووتیار تینی بۆ دێ، هاوار دەکات و دەڵێ: دەرم بێنن پێتان دەڵێم.

ئەوانیش بەهەر شێوەیەکی بێ کابرای جووتیار دێننە دەرێ، کابراش ڕادەوەستێ تاهەموو پووشەکە دەسووتێ، پاشان نۆکەرەکان لێی کۆدەبنەوە و لێی دەپرسن:

---

١- قۆریە گیا: گیای کۆکراوە بەشێوەیەکی زۆر.



www.iqra.ahlamontada.com

دەی بزانین چت دۆزیوەتەوە؟

کابرای جووتیار دەڵێ: خۆ پووشەکە هەمووی سووتا.

ئەوانیش دەڵێن: ئەرێ وەڵڵا.

کابراش دەڵێ: یەعنی ئەگەر منیش لەوێدابام دەسووتام.

ئەوانیش دەڵێن: ئەرێ وەڵڵا.

کابراش دەڵێ: ئنجا بۆچی من بسووتێم گوناحم چییە؟

لێرەدا پاشا زۆری پێ پێدەکەنێ و دەڵێ: ئەو کابرایە شێت بووە، بڕۆن بەریدەن بابڕوا.

ئەوجا کابرای جووتیار بەردەدەن و ئەویش دەڕواتەوە بۆ ماڵێ، بەڵام هەرلەبەر خۆیەوە ورتە ورتیەتی، وەختێکی دەگاتەوە ماڵێ، ژنەکەی بەرەو ڕووی دێ و دوای بەخێرهێنانەوەی لێی دەپرسێ:

ئەو کوپەڵە زێڕەت لەکوێ دۆزیوەتەوە؟

کابراش دەڵێ: کوا کوپەڵە زێڕەکە؟

ئەوجا ژنەکە کوپەڵە زێڕەکەی بۆ دێنێ، کابراش سەربردەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و تێر پێدەکەنن و منیش هاتمەوە و هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# گرەوی

# فەقێ و شازادە



www.iqra.ahlamontada.com

# گرەوی فەقێ و شازادە

فەقێیەك هەبوو بۆ مەلایەتی لەکن مەلایەکی دەیخوێند، داك و بابی ئەو فەقێیەی هەرچی ماڵ و سەروەتێکی هەیانبوو بۆ ئەو کوڕەیان فرۆشت، بۆ ئەوەی خوێندنەکەی پێ تەواوکا. هەر جارێکیش فەقێ دەهاتەوە بۆ ماڵێ، هەستیدەکرد ماڵەکەیان کەمیکردووە، هەتا دواجار لەداك و بابی پرسی: ئەو ماڵە بۆ واکەمی کردووە؟!

بابیشی گوتی: کوڕم هەرچی هەمانبوو نەمانبوو، بۆ تۆمان فرۆشت، بۆ ئەوەی خوێندنەکەتی پێ تەواوکەی.

ئەوجا فەقێ گوتی: مادام وایە، دەبێ لێرە بڕۆین.

بابی گوتی: بۆ کوێ؟

فەقێ گوتی: خوێندنەکەم تەواوکردووە و ناتوانم لێرە هیچ ئیشێك بکەم، بەڵام لە شوێنێکی کە دەتوانم سواڵیشتان بۆ بکەم.

باب وداکی فەقێ چونکە زۆر پیر و پەککەوتە بوون، هیچ دەسەڵات و توانایەکیان نەبوو بەرهەڵستی لە قسەی کوڕەکەیان بکەن، بۆیە بەناچاری سەری ڕەزامەندیان بۆ ڕاوەشاند و گوتیان: ڕۆڵە چۆن بەباشی دەزانی وابکە.



www.iqra.ahlamontada.com

ئـەوەبوو کـوڕە لەگـەڵ داك و بـابی ڕۆیـشتن و شـارەکەی خۆیـان بەجێهێشت. ڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە شارێکی کـە. لـەو شـارەی پاشایەك هەبوو، فەقێ بیریکردەوە کە دەبێ شتێك بکات بـۆ ئـەوەی خۆیی و داك و بابی لـەو نەبوونییـەی ڕزگاربکـا، بۆیـە بـەداك و بـابی گوت: ئێوە لێرە ڕاوەستن، ئێستا دێمەوە.

ئەوجا فەقێ ڕۆیشت و ڕوویکردە ماڵی پاشا و گوتی:

دەمەوێ پاشای ببینم. خەبەریان دایە پاشای.

پاشاش گوتی: بابێتە ژوورێ.

وەختێك فەقێ چووە ژوورێ، پاشا بەخێرهاتنی کرد و گوتی:

بۆچی هاتووی؟

فەقێ گوتی: من هاتووم دوو عەبد (کۆیلە)م پێیە دەیانفرۆشم.

پاشا گوتی: زۆر باشە، مادام ئی تۆن بیانهێنن.

ئەوجا نۆکەر چوون داك و بابی فەقێیان هێنان و پاشـاش لـەجیاتی پیاوەکە (بابی) ئەسپێکی باشی دایە و لـە جیـاتی ژنەکـەش (داکـی) دەستێك جلوبەرگی باشی پێبەخشی.

دوای ئــەوەی فــەقێ ئەســپ و جلکــەکانی لەپاشــای وەرگــرت، جلکەکانی لەبـەرکرد و سـواری ئەسـپەکەی بـوو لێیـدا ڕۆیـی و داك و بابی بەجێهێشت. لەو شارەی دوورکەوتەوە و بـەدوای بـەختی خـۆی



www.iqra.ahlamontada.com

کەوت. لەڕێگای تووشی سوارێك دەبێت. فەقێش بەڕێڕەوی لەکابرای سوارە دەپرسێ:

کابرا بۆ کوێ دەچی؟

کابراش دەڵێ: ڕاسپاردەیەکم پێیە، دەیبەم بۆ ئەو مەملەکەتەی لەسەر ڕێمانە. ئەگەر بیبەم (١٠٠) لیرەم دەدەنێ، ئەگەر ڕەفیقایەتیم دەکەی (١٠٠) لیرەکەی دەکەین بەنیوە، هەریەکەمان (٥٠) لیرە.

فەقێ دەڵێ: زۆرباشە. بەوشێوەیە ڕێکدەکەون و دەڕۆن. بەڵام لەڕێگای فەقێ بەکابرای دەڵێ: کوا ڕاسپاردەکە، بابزانم چی لێ نوسراوە؟ وەختێکی فەقێ دەیخوێنێتەوە، تەماشا دەکات لێی نوسراوە (بە گەیشتنی هەڵگری ئەو نووسراوەی دەستە و ئەجەل[1] لەسەری دەن) یەعنی بیکوژن، ئەوجا فەقێ ڕاسپاردەکەی دەدڕێنێ و دەڵێ: شتێکی ئاوای لێنوسراوە.

کابراش دەڵێ: زۆرباشە ودەگەڕێتەوە، ئنجا فەقێ دەستدەکاتەوە بەڕۆیشتن تادەگاتە ئەو شارەی، لەوێ جڵەوی وڵاخەکەی شلدەکا، دەڵێ ڕووی لەکوێ کرد،دەچمە ئەوماڵەی. بەڕێکەوت وڵاخەکەی ڕوودەکاتە حەوشەی ماڵێکی، کەتەنیا پیرێژنێکی لێدەژی.

ئەوجا فەقێ سەلام دەکا و دەڵێ: پورێ میوانان ڕادەگرن؟

---

١- دەستە و ئەجەل: یەکسەر، بێقەید و شەرت، بێ چەندوچوون.



www.iqra.ahlamontada.com

پیرێژنیش دەڵێ: میوان بەخێربێ سەرچاوان.

ئنجا فەقێ لەئەسپەکەی دادەبەزێ و دەڵێ: پورێ لەو مەملەکەتەی ئێوە چ باسە؟

پیرێژن دەڵێ: رۆڵە چت لێ بشارمەوە، کچێ پاشای ئەو مەملەکەتەی ئێمە زۆر حیلە بازە، هەرچی بچێتە داوای مەتەڵێکی لێدادێنی، ئەوەی نەیزانێ یەکسەر لەسەریدەدات. ئەو قەلایەی دەبینی هەموو بە کەللەسەران دروستکردووە. ئەوجا فەقێ دڵی دەگۆرێ و دەڵێ: وەڵلا منیش دەچم بزانم چۆن دەبێت.

پیرێژن دەڵێ: پێمچاکە نەچی، ئەو کچە زۆر حیلەباز و زۆرزانە.

فەقێ گوێ ناداتە قسەی پیرێژن و هەرچۆنێك بێ خۆی دەگەیەنێتە ماڵی پاشای و پاشای دەبینێ.

پاشا لێی دەپرسێ: بۆچی هاتووی؟

فەقێ دەڵێ: بیستوومە کچێکی وریا و زیرەکت هەیە، دەمەوێ بیبینم و ئەگەر بگونجێ خوازبێنی بکەم.

پاشا دەڵێ: پێم باشە نەچی؟ چونکە ئەو کچەی من هەروا بەئاسانی مێردی ناکات، ئەو گرەو لەسەر سەر دەکا، باشترە نەچی چونکە ئەو سەرەت ئی خۆت نابێ.

فەقێ دەڵێ: قەیناکە.



www.iqra.ahlamontada.com

هەرچۆنێکی بێ دەیبەن بۆ کن کچێ پاشای و پێی دەڵێن: ئەو مەلایە بۆ ئەوشتەی هاتووە.

کچێ پاشاش دەڵێ: زۆر باشە، بەلام مێردکردنی من دەستوورەکەی بردنەوەی گرەو و مەتەڵە، ئەگەر زانیت، ئەوە مێردت پێدەکەم، دەنا لەسەرت دەدەم.

فەقێش دەڵێ: زۆر باشە.

ئەوشەوەی تابەیانی کچێ پاشای مەتەڵ و پرسیار و گرەوی لەگەڵ فەقێی دەکا، فەقێ هەمووی جواب دەداتەوە. کچێ پاشای سەری سورِدەمێنێ لەزیرەکی فەقێی و نازانێ چی بکات! ئەوجا

فەقێ دەڵێ: هەرچی تۆ پرسیار و مەتەڵێکت هەبوو من جوابم دایەوە، منیش مەتەڵێکت لێدادێنم، ئەگەر زانیت لەسەرم دە(بمکووژە)، ئەگەر نەتزانی دەبێ مێردم پێبکەی.

کچی پاشای دەڵێ: زۆر باشە، مەتەڵەکەت چییە؟

فەقێ دەڵێ: ئەوە چییە سواری بابی بوو، داکی لەبەرکرد، گەیشتە مردنێ و گەڕایەوە.

کچێ پاشای دەڵێ: دەبێ ماوەم بدەیەی بیری لێبکەمەوە.

فەقێ دەڵێ: زۆرباشە بیری لێبکەوە.

کچێ پاشای هەرچەند سەری خۆی دێنێ و دەبا و هەموو کتێبەکانی دەگەڕێ، هیچ وەلامێکی دەستناکەوێ و بێ هیوا دەبێ،



www.iqra.ahlamontada.com

بۆیـه دوای سـێ ڕۆژ بیرکردنـەوە، شـەوێکی لەگـەڵ کارەکـەرێکی دەچـێتە ژووری فـەقێ و بـە فـەقێی دەڵـێ: نـازانم مەتەڵەکـەت لێکبدەمەوە، بۆیەش هاتووم بۆلات بۆ ئەوەی مزگێنی ئەوەت بدەمێ کـەتازە مـن ئـی تـۆم و تـۆش ئـی مـن، ئـەو ئەڵقەیـەی دەستیـشمت دەدەمێ بۆئەوەی بڕوام پێبکەی. ئەوجا فەقێ ئەڵقەکـەی لەدەسـتی دەکات و دەستدەکەن بەدەستبازی. لـەدوای هەنـدێ قـسە وگاڵتـە و گەپێکی زۆر، کچێ پاشای جوابی مەتەڵەکەی بەفەقێی دەدرکێنـێ و شەوێ خۆی لەفەقێی دەدزێتەوە. بۆ بەیانی جاڕدەدا و دەڵێ: بـڕۆن فەقێی بێنن، مەتەڵەکەم زانیوە و گرەوەکەم بردۆتەوە.

وەختێکـی سـبەینێ فـەقێی بەخەبـەردێنن، دەڵـێن: هەسـتە کـچێ پاشای ئیشی پێتە. وەختێکیش فـەقێ دەبینـێ کـچێ پاشـای لـەکن نەماوە زۆر دەترسێ، بەڵام کەئەڵقەکەی دەستی دەبینێ دڵی خـۆش دەبێت. هەڵدەستێ و دەڵێ: زۆر باشە، بەڵام من خـەونێکی ناخۆشـم دیوە، دەمەوێ پێش ئەوەی کچی پاشای لەسەرم بدات، بـۆ پاشـای بگێڕمەوە. هەر بۆیە ڕوو لەکۆشکی پاشای دەکات و دەڵێ:

دەمەوێ پاشای ببینم، خەونێکم دیوە بۆی دەگێڕمەوە. نۆکـەریش خەبەر دەدەنە پاشای و

پاشاش دەڵێ: بابێتە ژوورێ.



www.iqra.ahlamontada.com

وەختێکی فەقێ دەچێتە ژووریٚ بۆ لای پاشای، پاشا دەڵێ: چییە فەقێ خەونی چیت دیوە؟ دەی بۆم بگێڕەوە.

فەقێش دەڵێ: پاشا ئەو شەو لەخەونمدا دەعبایەکی جوان و نەرمونۆڵم لەباوەشدابوو، دوای ئەوەی زۆرم هەڵگڵۆفی لەدەستم هەڵفڕی، بەڵام پەڕێکم بەدەستەوە هات.

پاشاش دەڵێ: ئەی کوا پەڕەکە.

فەقێش ئەڵقەکەی دەستی نیشان دەدا و دەڵێ: ئەوەتا پاشا.

پاشا دوای ئەوەی گوێی لەفەقێ بوو و ئەڵقەکەی دەستی ناسیەوە کە ئی کچەکەیەتی، هەروەها خەبەری ئەوەشی زانیبوو کەکچەکەی هەموو کەسی خەریك کردووە بەوەی گوایە مەتەڵی فەقێشی زانیوە، تێدەگا مەسەلەکە چییە و چۆنە. بۆیە دەڵێ:

بڕۆن ئەو کچەی من بێنن، دیارە هەر ئاوای کردووە شەوێ دەچێ خۆیان پێ بە (...) دەدات و بەفێڵ قسەیان لێدەردێنێ و بەیانیش لەسەریان دەدا.

ئەوجا پاشا دێنێ کچەکەی خۆی لە فەقێی مارەدەکا و فەقێش دەکاتە دەمڕاستی خۆی.

فەقێش دوای ئەوەی دەسەڵاتێکی باش پەیدادەکا لەلای پاشای، دەچێتەوە ئەو شارەی کەداك و بابی لێ فرۆشتبوو، دەیانکڕێتەوە و دەیانهێنێتەوە بۆ کن خۆی... منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.



www.iqra.ahlamontada.com



# ئەحمەد پاشا و ئەژدیها

www.iqra.ahlamontada.com

# ئەحمەد پاشا و ئەژدیها[1]

پاشایەك دەبێ سێ كوڕی دەبێ، مەحموود و محەمەد و ئەحمەد. ئەو پاشایە بەهەر جۆرێك بێت لە پاشایەتی دەخرێ و هیچی بەدەستەوە نامێنێ و كوڕەكانیشی بێدەسەلات و بێكار دەمێننەوە. تەنیا وەزیرە دڵسۆزەكەی نەبێ، كەئەویش لەخۆی پیرتر دەبێ. بەڵێ ڕۆژ هات و چوو، ئەو پاشایە تادەهات وەزعی خراپتر دەبوو و هیچی بەدەستەوە نەمابوو خۆیی و وەزیرەكەی پێ بژێنێ. بۆیە بەناچاری ڕوو لەكوڕەكانی دەكا بۆ ئەوەی بەخێوی بكەن. یەكەمجار ڕووی لەمەحموودی برا گەورەیان كرد و پێی گوت:

كوپەڵە زێڕێكم لەفلانە زەویەیدا شاردۆتەوە، ئەگەر مانگێكی لەگەڵ ئەو وەزیرەم بەخێوم كەی و ئەگەر مردم، ئەوە كوپەڵە زێڕەكەی دەربێنەوە بۆ خۆت، بەڵێ مانگ تەواوبوو، پاشا نەمرد و مەحموودی بەجێهێشت و چوو بۆ كن محەمەدی كوڕی نێوەنجی و پێی گوت:

---

١– لە دەستنووسی (كۆمەڵێك چیرۆكی فۆلكلۆریی پەندئامێز) كۆكردنەوەی: سەلام مەنمی، چیرۆكێك هەیە بەناوی (مرۆڤی زیرەك) كە لەم چیرۆكەوە نزیكە، بەڵام جیاوازییان زۆرە و ئەمەیان دوور و درێژترە، هەردووكیان بابەخی خۆیانیان هەیە، لەبەرئەوە هەردووكیان وەك خۆیان بڵاوكراونەتەوە...



www.iqra.ahlamontada.com

ئەگــەر مــانگێکی بەخێومکــەی، کوپەڵەیــەك زێــڕم هەیــە لەفلانــە زەویەی ئەگەر مردم بڕۆ دەری بێنەوە بۆ خۆت، بەڵێ مانگ تێپــەڕی و دیسان پاشــا نــەمرد و ئــەوجا ڕووی لــەماڵی کــوڕی چــووکی کــرد و گوتی:

ئەگەر یەك مــانگی بەخێومکــەی، کوپەڵــە زێــڕێکم لەفلانــە زەویــەی شاردۆتەوە با بۆ تۆ بێ. بەڵێ پاشا مــانگی تەواونــەکرد و واڕێکــەوت بۆخــۆی و وەزیرەکــەی مــردن، ئــەوجار هەرچــی دەچــوو کوپــەڵــە زێڕەکــەی بێنێتــەوە بــە دەســتی بــەتاڵ دەهاتــەوە، بۆیــە لەیەکــدی کەوتنە تەقە و یەکدیان تاوانبار دەکرد و یەك بەیەکی دەگوت:

ئەتو کوپەڵە زێڕەکەت دزیوە.

براگەورەکەیان (مەحمود) دەڵێ: پێویــست ناکــات بابــچین شــەرعی بکەین، چەند دەگەڕێن کەس نابێت شەرعیان بکات. هەربۆیــە دەڕۆن ڕوو لەمەملەکــەتێکی دی دەکــەن، لەرێگایــەش بەســەرپێی و لەبــەر خۆیانەوە قسان دەکەن،

مەحموود دەڵێ: ئەگەر ئــەقڵم پێبــشکێ، حوشــترێك بــەو ڕێگایەیــدا هــاتووە و چــاوێکی کــوێرە و دانێکیــشی کەلــە، محەمــەدیش دەڵــێ: وەڵڵاهـــی دەنــا بارێکیــشی پێوەیــە تایــەکی ڕۆنــە و تایەکیــشی هەنگوینە، ئەحمەدیش دەڵێ: پێم وابێ ژنێکی حامیلەشی لەسەرە.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵێ زۆر دەڕۆن یان کەم، تووشی کابرایەکی عەرەبی عەگال بەسەر دەبن و سەلامی لێدەکەن، کابرای عەرەبیش دەڵێ: ئەرێ کاکە هیچ حوشترتان نەدیوە؟

مەحموود دەڵێ: ئەو حوشترەی چاوێکی کوێرە و دانێکیشی کەلە؟

محەمەدیش دەڵێ: بارێکیشی پێوەیە تایەکی ڕۆنە و تایەکیشی هەنگوینە.

ئەحمەدیش دەڵێ: پێم وابوو ژنێکی حامیلەشی لەسەر بوو.

کابرای عەرەب دەڵێ: ئەرێوەڵڵا ئەوە حوشترەکەی منە، ئێوە دزیوتانە، پێتان دەبڕژێرم. هەرچەندە دەڵێن کابرا ئێمە هەر لە خۆمانەوە ئەو قسانەمان کردووە و ئاگامان لەحوشتری تۆ نییە. نایبیستێ و ناچار مەحموودی براگەورەیان دەڵێ: کاکە ئێمە بۆ شەرعی دەچین ئەگەر ئەتۆش دێی لەگەڵمان باشە و لەوێ شەرعی دەکەین، ئەگەر شەرع بەلای ئەتۆدا هات، ئەوە حوشترەکەت بۆ دەبژێرین، دەنا هیچ. کابرای عەرەبیش دەڵێ: زۆر باشە و دەڕۆن.

بەڵێ زۆر و کەم، دەگەنە مەملەکەتێکی و دەچنە دیوەخانی پاشای ئەو مەملەکەتەی و خەبەردەدەنە پاشای کە ئەوانە بەدوای شەرعی خۆیان کەوتوون،پاشاش دەڵێ:



www.iqra.ahlamontada.com

جارێ خواردنیان بۆ ببەن، ئەوجا خزمەتکار دێن خواردنیان بۆ دێنن، بەڵام کەسیان دەست بۆ خواردنەکەی نابات و لەیەکدی دەپرسن بۆ ناخۆی؟ ئەوجا

مەحموود دەڵێ: ئەمن نانی پیاوی بیژوو[1] ناخۆم.

محەمەدیش دەڵێ: وەڵڵاهی ئەمنیش گۆشتی مردارەوەبوو ناخۆم.

ئەحمەدیش دەڵێ: دەوەڵڵاهی ئەمنیش برنجی کەللەسەرم پێناخورێ. بەڵام کابرای عەرەب گوێ ناداتێ و نانی خۆی دەخوا.

بەڵێ، وەختێکی خواردنەکەی بەخڕی دەبەنەوە و پاشاش چاوی پێدەکەوێت، بە خزمەتکارەکەی دەڵێ: ئەوە بۆچی نەیانخوارد، خواردنەکەیان پێخۆش نەبوو؟! خزمەتکارەکەش حاڵ و مەوزوع و قسەکانی ئەوانی بۆ دەگێڕێتەوە، پاشا لەو قسانە سەری سووڕدەمێنێ و لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

کەوابێ دەبێ من بیژوویم، دەبێ وەدوای ڕاستی قسەکانیان کەوم، ئەگەر ڕاستکەن، ئەوە خەڵاتیان دەکەم، دەنا لەسەریان دەدەم. هەربۆیە دەچێتە کن داکی و پێی دەڵێ: دایە من لە کێ بووم؟ داکیشی دەڵێ: ڕۆڵە چ خەبەرە، تۆ لەبابی خۆت بووی.

پاشاش دەڵێ: دایە وانییە، ئەگەر ڕاستیم پێنەڵێی ئێستا ئەمردەکەم لەسەرتدەن. ئەوجا داکی ترسی لێدەنیشێ و دەڵێ:

---

١- بیژوو: زۆڵ. ئەو منداڵەی دایکی ناسراوە و باوکی نەناسراو...



www.iqra.ahlamontada.com

ڕۆڵە چت لێبشارمەوە، ساڵێکی بابت چوو بۆ حەجێ، قولەیەکی ڕەشی خزمەتکاری هەبوو، ئەتۆ لەو قولەی... پاشا دەڵێ زۆرباشە و ڕاستدەکەن ئەمن بیژووم. دوایی دەڕوات بۆ کن جۆوانی[1] و دەڵێ:

جۆوان ئەو برنجەی بۆ منت هێناوە لەکوێت بووە؟ جۆوانیش دەڵێ:

پاشا ئەو برنجە ئی مەرەزەکەی خۆتە و هیچ عەیب و عارێکی نییە، پاشاش دەڵێ:

ئەگەر راستیم پێنەڵێی هەر ئێستا ئەمردەکەم لەسەرتدەن.

جۆوانیش دەڵێ: پاشا چت لێبشارمەوە، ساڵێکی لەو کێوەی دەهاتمەوە لەدوورەوە دوو گوڵە برنجم دیتن، وەختێك لێیان چوومە پێشێ، تەماشادەکەم ئەو دووگوڵە لەناو کەللە سەرێکی هاتوونەتە دەرێ، ئەو برنجەی بۆ تۆم هێناوە لەتۆوی ئەو دووگوڵە برنجەم پاشەکەوت کردووە...

پاشا دەڵێ: زۆرباشە ئەوەش ڕاستە و دەڕوات بۆ کن شوانی و دەڵێ: شوان ئەو بەرخەی بۆ منت هێناوە، بەرخی چ مەڕێکی بوو؟

ئەویش دەڵێ: پاشا بەرخی مەڕەکانی خۆت بوو، پاشاش دەڵێ:

---

١- جۆوانی: سەپانی برنج، ئەو کەسەی بە شەو و رۆژ پاسەوانی مەرەزەی برنج دەکات تا پێدەگات.



www.iqra.ahlamontada.com

پێویست ناکا شوان درۆمان لەگەڵکەی ئەگەر ڕاستم پێنەڵێی ئێستا ئەمردەکەم لەسەرتدەن.

شوانیش دەڵێ: پاشا چت لێبشارمەوە، ساڵی پار مەڕێکم هەبوو ئەو بەرخەی بوو کەبۆ تووم هێنا، قەزاوقەدەر مەڕەکە مرد. ئەمنیش بەرخەکەم بەشیری ئەو دێڵە سەیەی گەورەکرد، پاشا دەڵێ:

ڕاستدەکەن ئەویش مرداره.

ئەوجا پاشا دێتەوه بۆ ماڵێ و دەچێتە دیوەخانێ و بۆئەوەی دڵنیاش بێ لەڕاستی قسەکانیان، نارنجێکی دەخاتە نێو باخەڵی و دەڵێ: مادام ئێوه پیاوێکی هێنده ئاقڵ بن، دەبێ بزانن ئەمن چم لەباخەڵیدایه؟ مەحموود گوتی: پاشا ئەوەی لەباخەڵتدایه: خڕه وەك گۆ.

محەمەدیش: گوتی شله وەك دۆ.

ئەحمەدیش گوتی: یان نارنجه یان لیمۆ. پاشا سەری لەزیرەکی ئەوان سوورما و گوتی:

کاکه خواحافیزتان بێ، شەرعی ئێوه بەمن ناکرێ.

ئەوجا مەحموود و محەمەد و ئەحمەد و کابرای عەرەب هەستان و ڕۆیشتن، کەم ڕۆیشتن یان زۆر ڕۆیشتن، گەیشتنه مەملەکەتێکی دیکه و خەبەریان دایه پاشای و گوتیان :

پاشا میوانت هاتووه.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا فەرمووی لێکردن و ئەوانیش چوونە ژوورێ و حاڵ و وەزعی خۆیان بۆ گێڕایەوە و

پاشاش گوتی: بەو شەرتەی شەرعتان دەکەم، ئەگەر شەرعم کردن دەبێ حەوت ساڵان خزمەتمکەن. ئەوانیش دەڵێن: زۆر باشە، ئنجا پاشا دەڵێ:

ئەی ئەو کابرا عەرەبە چییە لەگەڵتان؟ ئەوانیش دەڵێن:

وەڵڵاهی پاشا چت لێبشارینەوە، ئەو کابرایە حوشترێکی لێونبووە، لەڕێگایەش تووشی ئێمە بوو، لەئێمەی پرسی حوشترەکەی منتان نەدیووە؟ ئێمەش هەرلەبەر خۆمانەوە و بەئەقڵ نێونیشانی حوشترەکەمان گوت، ئەویش گوتی: ئەو حوشترە ئی منە و ئێوە دزیوتانە و لەئێوەم دەوێتەوە. ئێمەش لەگەڵ خۆمان هێناوە تا شەرعی بکەین. ئێستا ئێمە چ بکەین؟

پاشاش گوتی: زۆرباشە ڕاوەستن، ئێستا شەرعتان دەکەم، ئەوجا پاشا هەستا چووە دەرێ و نارنجێکی لەبن باخەڵی ناو هاتەوە و گوتی: مادام ئێوە بەئەقڵ قسان دەکەن، دەبێ بزانن ئەمن چم دەباخەڵی دایە؟ ئەوجا مەحموود دەڵێ: پاشا پێم وایە ئەو شتەی لەباخەڵتدایە خڕە وەك گۆ.

محەمەدیش دەڵێ: دەناوەڵڵا شلیشە وەك دۆ.

ئەحمەدیش دەڵێ: دە کەوابێ یان نارنجە یان لیمۆ.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا دەڵێ: ڕاست دەکەن، بۆیە بەکابرای عەرەب دەڵێ:

کابرا ئەوانە هەر بەئەقڵ قسەیان کردووە و حوشتری تۆیان نەدزیوە، ئەتو برۆ ئەمن شەرعی ئەوانە دەکەم.

پاشا چەند لەگەڵیان قسان دەکات. هیچیان خۆیان بەدز نازانن. هەر بۆیە پاشا هەر ڕۆژەی یەکێکیان دەبات بۆ ڕاوێ. ڕۆژی یەکەم مەحموودی براگەورەیان لەگەڵ خۆی دەبا و لەوێ دەڵێ:

مەحمود ئەگەر ئێستا لێرە ژنێکی جوان و ناسکت دەستکەوێ لەو لێرەوارە چۆڵ و هۆڵەی چی لێدەکەی؟ مەحموودیش دەڵێ: وەڵڵاهی پاشا ئەگەر بەحەڵاڵی بێ، هەرچیم پێخۆش بێ لەگەڵی دەکەم، بەڵام ئەگەر بەحەڵاڵی نەبێ وەڵڵا هیچی لێناکەم. هەرچەند پاشا شێر و ڕێوی بۆ دێنێتەوە، بەڵام مەحموود هەر سووردەبێ لەسەر قسەی خۆیی و پاشاش دەڵێ:

بابرۆینەوە ئەتۆ نەتدزیوە. بەڵێ ئەو ڕۆژەی دێنەوە و بۆ ڕۆژی دوایی پاشا محەمەدیان لەگەڵ خۆی دەبا و هەمان قەوانی مەحموود بۆ ئەویش دەڵێتەوە و شێر و ڕێوی زۆریش بۆ وی دێنێتەوە، بەڵام محەمەد دەڵێ: پاشا ئەگەر بەحەڵاڵی بێت هەموو شتێکی لێدەکەم، دەنا بەحەرامی دەستی ناکەمێ.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا دەڵێ: بابڕۆینەوە ئەتۆش نەتدزیوە. بۆ ڕۆژی دوایی پاشا ئەحمەد یان لەگەڵ خۆی دەبات و هەمان قەوانیش بۆ ئەحمەد لێدەداتەوە، بەڵام ئەحمەد دەڵێ:

وەڵڵا پاشا هەرچی پێم خۆشبێ لەگەڵی دەکەم.

پاشاش دەڵێ: دەکەوابێ ئەتۆ کوپەڵە زیڕەکەت دزیوە. ئەحمەدیش دەڵێ: بەڵێ پاشا ئەمن دزیومە. پاشاش دەڵێ: زۆر چاکە و دەڕۆنەوە.

پاشا دەڵێ: من شەرعم کردن ئەوجار لەسەر ئێوەیە خزمەتمکەن.

ئەحمەدیش دەڵێ: بەو شەرتەی هەرچی نوقسانی بەلادا هات، شەرتمان دەپەڕێ[1]

پاشا دەڵێ: زۆر باشە.

بەڵێ ماوەیەك دەمێننەوە و شەوانە بە نۆرە حەرەسیاتی لێدەگرن. شەوێکیان بەری بەیانی سەرەی ئەحمەدی دەبێ، ئەحمەد تەماشا دەکا ئەوە ئەژدیهایەك خەریکە بەپاشایەوە دەدا، ئەحمەدیش خێرا دەست دەداتە شیرەکەی و ئەژدیهایەکەی دەکوژێ و لەبن چەپەڕێکی دەشارێتەوە. وەختێکی پاشا بەخەبەردێ، تەماشا دەکا

---

١- بەو شەرتەی هەرچی نوقسانی بەلادا هات، شەرتمان دەپەڕێ: واتە هەر کەسێك لە ئێمە کەمتەرخەم بوو لە مەرجەکان، ئەو شەرت و مەرجەی نێوانمان هەڵدەوەشێتەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوە ئەحمەد خەریکە شیرەکەی دەسڕێتەوە، هەربۆیە هاواردەکا ودەڵێ: فریام کەون ئەحمەد خەریکە دەمکوژێ. ئەوجا نۆکەری پاشای دێن و ئەحمەدی دەبەنە دەرێ و پاشا دەڵێ:

هەڵیواسن دەبێ لەسەریدەم. بەڵێ پاشا لەدوای پیاوماقوڵان و خەڵکی دەنێرێ بۆ ئەوەی لەسەری ئەحمەدی بدا و دەڵێ: لەسەریدەن، هەرچەند برایەکانی دەڵێن پاشا لەبەر ئێمە ئەوجارە عەفووی کە. پاشا نایبیستێ و دەڵێ ئەگەر ئەو سەعاتەی بەخەبەر نەهاتبام، ئەحمەد دەیکوشتم. ئنجا مەحموود دەڵێ: پاشا مادام هەردەیکوژی، با نەزیلەیەکت بۆ بگێڕمەوە.

پاشاش دەڵێ: دەی باشە.

مەحموود دەڵێ: پاشا کابرایەك دەبێ لەماڵی دنیایە تەنها بازێکی دەبێ. ئەو کابرایە هەر ڕۆژێکی خۆش بێ ئەوە بازەکەی لەسەردەستی دادەنێ و دەڕوا بۆ ئەو کەژ و کێوەی. ڕۆژێك کابرا زۆر بەکێو و بانانددا دەگەڕێ و زۆریش ماندوودەبێ و تینووی دەبێ، بەڕێکەوت تووشی جۆگەلە ئاوێکی دەبێ. دادێتەوە ئاوێ بخواتەوە کەچی بازەکەی دندوکێکی لەسەری دەدا و نایەڵێ بیخواتەوە. کابراش دەڵێ: ئەی بۆ وادەکەی؟ جاری دووەمیش دادێتەوە تا ئاوێ بخواتەوە، کەچی ئەوجارەش بازەکە دندوکێکی بەسەریدا دەدا و نایەڵێ ئاوەکەی بخواتەوە. کابراش زۆر تووڕەدەبێ و سوێندی



www.iqra.ahlamontada.com

دەخـوا ئەگـەر ئـەوجارەی وابکاتـەوە ملـی لێهەڵدەقـەنێ. بـەڵێ ئـەوجارەش کـابرا داهاتـەوە تـا ئـاوێ بخواتـەوە، بـەڵام ئـەوجارەی بازەکـە واداهاتـە سـەری کـابرای لەگـەڵ دنـدوکی گۆشـتی لەسـەری کـابرای پـچڕی. کـابراش لـەتینوان و لـەڕقان بازەکـەی گـرت و ملـی لێهەڵقەند. ئەوجا کابرا گوتی: وەڵڵاهی بێحیکمـەت نییـە ئـەو بـازەی وایدەکرد. دەبێ بچم بزانم سەرچاوەی ئـەو ئـاوەی لەکوێیـە؟ بـەڵێ کـابرا ئاوەکـەی نـەخواردەوە و بەئاوەکەیـدا پێهەڵاچـوو، وەختێکـی دەگاتــە سەرچــاوەی ئاوەکــەی، دەبینــێ ئــەوە عەزیایــەك دەمــی بەئاوەکەیدا هێناوە و ژەهرەکەی دەڕژێتە نـاو ئاوەکـەی. وەختێکـی کابرا ئەوەی دی، زۆر خەفەتی بـۆ بازەکـەی خـوارد و زۆر پەشـیمان بـوو لـەوەی کەبازەکـەی کوشـتووە، هەربۆیـە لـەتاوی بازەکـەی و لەتینوانیش وەزگیدا و مرد. دەترسێم ئەتۆش دوای ئەوەی لەسـەری ئەحمەدی برامان دەدەی و ئێمەش دەردەکەی، بۆخۆت لەپەرۆشیان وەزگ دەی و بمری.

پاشا گوتی: ئەو سەرە بەو قالبەیەوە نابێ و هەر دەیکوژم. ئەگـەر ئـەو سـەعاتەی بەخەبـەر نـەهاتبام ئەحمـەد دەیکوشـتم. ئـەوجا محەمەدیش دەڵـێ: پاشـا مـادام ئـەتۆ هـەر سووری لەسـەر ئـەوەی لەسەری ئەحمەدی برامان بدەی، پـێم خۆشـە ئـەمنیش نەزیلەیـەکت بۆ بگێڕمەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

پاشاش گوتی: هەرچیم بۆباس کەی ناچێتە گوێمەوە و هەر دەیکوژم. بەڵام قەیناکە تۆش قسەی خۆت بکە، ئنجا ئەحمەد ڕووی لەپاشا کرد و گوتی:

پاشا، دەگێڕنەوە دەڵێن پاشایەك دەبێ دەچێتە ڕاوێ و بولبولێکی دەگرێ و دەیهێنێتەوە و لەقەفەزی دەکات.

ڕۆژێکی بولبول بەپاشای دەڵێ: پاشا ئەمن چم هەتا ئەتۆ بمگری ودڵم پێخۆشکەی؟! ئەگەر بەرەڵامکەی دەچم میوەی بەهەشتێت بۆدێنم، نیوەی عومرت بۆ دەگێڕمەوە.

پاشاش دەڵێ: باشە وبەرەڵای دەکا. خزمەتکارەکەی پاشاش گوێی لەو قسانە دەبێ. لەدڵی خۆیدا دەڵێ: دەبێ ئاگام لەو بولبولەی بێ، ئەگەر هاتەوە، پێش ئەوەی بچێتە کن پاشای، من مزگێنی دەدەمە پاشای بۆ ئەوەی خەڵاتێکی باشی لێوەرگرم.

بەڵێ بولبول ڕۆیشت وچەند ڕۆژێکی پێچوو هاتەوە و خزمەتکارەکەی پاشای ئاگای لێنەبوو. خۆی لەباوەشی پاشای هاویشت و دنکە سێوێکی بۆ پاشای هێنابوو و بەپاشای گوت: ئەو دنکەی بچێنە و خزمەتی بکەن تا بەبەر دێ، دوو سێوی دەگرێت. هەر سێوێکی نیوەی عومرت بۆ دەگێڕێتەوە. پاشاش بانگی خزمەتکارەکەی دەکا و دەڵێ: ئەو دنکە سێوەی بچێنە و ئاگاداریبە وخزمەتی بکە هەتا بە بەردێ. خزمەتکارەکەش دەڵێ: باشە و



www.iqra.ahlamontada.com

دەیچێنێ و خزمەتیدەکا تا بە بەردێ و دوو سێوی جوان دەگرێ، پاشاش کەدەزانێ سێوەکەی پێگەیشتووە، داوا لەخزمەتکارەکەی دەکا سێوەکانی بۆ لێکاتەوە و بۆی بێنێ، کابرای خزمەتکاریش بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لەبولبولەکەی بکاتەوە ؟چونکە نەیهێشتبوو مزگێنی هاتنەوەی بەپاشا ڕابگەیەنێ، دەچێ هەردوو سێوەکەی لێدەکاتەوە و دەیانشارێتەوە و دووسێوی دیکە دێنێ پڕیان دەکا لەژەهر و بۆ پاشایان دەبا و پاشاش دەڵێ:

بیانهێنن تابیانخۆم، بزانم بولبول ڕاستدەکا.

خزمەتکارەکەشی دەڵێ: پاشا باڵدار ئی بەقایە[1] نییە، قاشێکی بدە بەو تاژیەی بزانە چی لێدەکا. وەختێکی پاشا قاشێکی سێوەکەی بۆ تاژیەکەی فڕێدەدا و دەیخوا، یەکسەر دەیکوژێ! خزمەتکارەکەشی دەڵێ: پاشا نەمگوت باڵدار ئی بەقایە نییە؟ ئنجا پاشا زۆر تووڕەدەبێ و بولبولەکەی دەکوژێ و زۆر خەفەتان دەخوا. ئەوجا پاشا دەڵێ: دەبێ بۆ ساڵی دادێ ئاگاداریەکی باشی ئەو دارەم بۆ بکەن.

بەڵێ ساڵ تێوەر دەسوڕێتەوە و دارەکە سێ سێوی جوان دەگرێ و سێوێکی بۆ پاشای دەبەن. وەختێکی پاشا سێوەکەی دەخوا، نیوەی عومری بۆ دەگەڕێتەوە و زۆر پەشیمان دەبێتەوە لەوەی

---

١- بەقایە: بڕوا، متمانە.



www.iqra.ahlamontada.com

کەبولبولەکەی کوشتووە وخزمەتکارەکەی بانگدەکا و زۆری بۆ دێنی، تا ڕاستی فرت و فێڵەکەی خۆی بەپاشا دەڵێ و پاشاش یەکسەر دەڵێ: لەسەریدەن.ئەوجا پاشا لەخەفەتی بولبولەکەی وەزگ دەدا و دەمرێ.

دەترسێم ئەتۆش دوای ئەوەی ئەحمەدی براما ن لە سێدارە دەدەی و ئێمەش دەردەکەی لە خەفەتان بمری، پاشا دەڵێ: ئەو قسانەم ناچنە دەگوێی و ئەوسەرە بەو قالبەیەوە نابێ. ئەو دەمەی بەخەبەر نەهاتبام ئەحمەد دەیکوشتم.

بەڵێ زۆر و کەم، لەگەڵ پاشای خەریك دەبن پەشیمانی بکەنەوە لەو بڕیارەی، پەشیمان نابێتەوە.

ئەوجا ئەحمەد دەڵێ: پاشا مادام هەر سووری لەسەر قسەی خۆت و هەر لەسەرم دەدەی، بە خزمەتکارەکانت بڵێ با ئەو چەپەرەی لادەن. وەختێکی چەپەرەکەی لادەدەن، دەبینن ئەژدیهایەکی لەبن دایە و ئەحمەد دەڵێ:

پاشا من ئەگەر شیرم بەدەستەوە بوو، ئەو عەزیایەم لەسەر تۆ کوشتووە، بۆیە شیرەکەم دەسڕیەوە، ئەوجا پاشا زۆر پەشیمان دەبێتەوە و چەند لێیان دەپاڕێتەوە کەبەجێینەهێڵن، بەڵام ئەحمەد دەڵێ:



www.iqra.ahlamontada.com

پاشا بڕیارمان وابوو هەرچی ئەو بڕیارەی بەلادا هات، شەرتەکەمان دەپەڕێ، ئەوە بڕیارەکەش بەلای تۆدا هات و ئێمەش دەڕۆینەوە مەملەکەتی خۆمان و خواحافیز.

ئەوجا ئەحمەد و محەمەد و مەحموود دەگەڕێنەوە مەملەکەتی خۆیان و کوپەڵە زێڕەکەی دێنن لە نێوان خۆیان بەشی دەکەن و دەچنەوە ماڵی خۆیان و ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# ژنێکی مەکرباز

لەلادێیەکی لاچەپەکدا، کابرایەکی فەقیرحاڵ دەبێ. ئەو کابرایە کاروکاسبی بەخێوکردنی مەڕ ومالآت و زەویی وزار دەبێ، بەلآم ژنێکی عەیار و مەکربازی دەبێ. ئەو ژنە فەقیرحاڵی پیاوەکەی بەهەل دەزانێ، هەربۆیە لەپەنا مێردەکەیەوە دۆست ودەزگیراانان بۆ خۆی پەیدادەکا و هێندە گوێ بەقسە و داوای مێردەکەی نادا. ئەو مێردە داماوەشی ئاگای لەهیچ نییە و ڕۆژانە دەچێ برنج و گۆشت و ڕۆنی بۆ دەکڕێ و بۆی دێنێتەوە و دەڵێ: بۆ بەیانی بۆم لێنێ، ئەگەر لەجووتی هاتمەوە دەیخۆم، بەلآم ژنە هەر ڕۆژەی بەفێڵێك خواردنەکەی لەبیردەباتەوە و پێش ئەوەی بێتەوە کەڵەگایەکانی[1] خۆی بانگدەکا و خواردنەکەی دەخۆن. ئەو فرت و فێڵەی ژنەش چەند جارێکی دووبارە دەبێتەوە، هەتا ڕۆژێکی جومعە بەسەردادێ و پیاوەکە دەڵێ: سبەینێ لەماڵێ دەبم، تا لەجومعەی دێمەوە دەبێ بۆم لێنێی، ژنەش دەڵێ:

---

١- کەڵەگا: لە ڕاستیدا لە (گا)ی کەڵهاتووەوە هاتووە، بەلآم لێرەدا بۆ کەسێك بەکارهاتووە کەژنە کردوویەتی بەمێردێکی نهێنی و ناشەرعی خۆی...



www.iqra.ahlamontada.com

باشه، بەو قەرارەی هەرچی لەدەستە ڕاستت نوێژی کرد، لەگەڵ خۆتی دێنیەوە.

کابراش دەڵێ: باشە.

ئەوجا ژنە هەڵدەستێ خەبەر دەنێرێ بۆ دۆستەکەی کەبەیانی بچێ لەدەستە ڕاستی مێردەکەی نوێژێ بکا، بۆ خۆشی خەریکی خۆڕازاندنەوە دەبێ، دۆستەکەشی خزمەتکارێکی پاشای دەبێ، ئەو ڕۆژەی پاشا بە ئیشێك دەینێرێ بۆ جێگایەکی. پیرەمێردیش، دوای ئەوەی لەنوێژێ دەبێتەوە، تەماشای دەستە ڕاستی دەکا، پیاوێکی لەخۆی پیرترە، بۆیە دەستی کابرای دەگرێ و بەزۆر لەگەڵ خۆی دەباتەوە، هەرچەند کابرای پیرە دەڵێ: نایەم. بەڵام پیاوەکە دەڵێ: من عادەتم کردووە هەموو جومعەیەك هەرچی لەدەستە ڕاستم نوێژێ بکا، دەبێ نانی نیوەڕۆیە لەماڵی من بخوا.

وەختێکی دەگەنەوە ماڵێ و ژنە دەزانێ دۆستەکەی نییە، خێرا هەڵدەستێ خواردنەکەی دەشارێتەوە، هەرچەند مێردەکەی دەڵێ: ژنەکە نانی بێنە تا بیخۆین، ئەو جوابی ناداتەوە. هەتا دێتە کن ژنەکەیی و دەڵێ: بۆچی نانمان بۆ نایەنی؟

ژنەش دەڵێ: پیاوەکە ئەی نابێ تفاقی بدەیە ماڵاتەکەی[1]؟

کابراش دەڵێ: وەڵڵاهی ڕاست دەکەی.

---

١- ماڵات: ڕەشەوڵاخ و گاو گوڵ.



www.iqra.ahlamontada.com

بەو فێڵەی مێردەکەی دەنێرێتە ژووری ماڵاتی و بۆ خۆشی دێ لەبەرامبەر کابرای دادەنیشێ ودەسکە (سندۆڵ[1]) ێکیش لەکن خۆی دادەنێ و هەر گەرمی دەکا و چەوری دەکا، کابرای پیرەش لەبەرخۆیەوە دەڵێ: دەبێ ئەو دارەی بۆ چبێ؟ ئنجا لەژنەی دەچێتە پێشێ ودەڵێ: براژن ئەو سندۆڵەی بۆچی چەور دەکەی خێرە؟ ژنەی مەکربازیش دەڵێ: وەڵڵا خاڵی خۆم چت لێبشارمەوە، عادەتێکی هێندە خراپمان هەیە.... پیرەش دەڵێ: عادەتی چی؟

ژنەش دەڵێ: هەر کەسێك بێتە ماڵمان دەبێ پێش ئەوەی نانی بخوا،ئەو سندۆڵەی تێبڕین[2]، ئنجا نانی بخوا. کابرای پیرە زۆر دەترسێ، هەڵدەستێ عەبایەکەی کۆدەکاتەوە و هەڵدێ، لەو دەمەشدا مێردی ژنەی دێتەوە ژوورێ و دەڵێ:

ئەی کوا کابرای پیرە؟

ژنەش دەڵێ: پیرەی کوێ؟ برۆ بیگەیە چێشتەکەی لەبن هەنگڵی[3] ناو بردی، کابراش هێندە فەقیرحاڵ دەبێ، دەڵێ: ژنەکە نانێکم دەیە بزانم هێندێکی لێناستێنمەوە. هەربۆیە دوای پیرەی دەکەوێ و هاواردەکا خێرت دەگاتێ ڕاوەستە هەر ئەو نانەم بۆ چەورکە،

---

١- سندۆڵ: دارێکی خۆشدەست و لووسە و لەلادێدا، زۆرکاری پێدەکرێ.

٢- تێبڕین: تێخستن، کردنی شتێك بەشتێکی دیکەدا.

٣- هەنگڵ: باڵ، قۆڵ.



www.iqra.ahlamontada.com

کابرای پیرەش وادەزانێ کابرا دەسکە سندۆڵەکەی پێیە و دەیەوێ تێی ببڕێ، بۆیە بەڕاکردنەوە دەڵێ:

وەڵلاّ راناوەستم ئەگەر لە (...) داکتی ببڕی، دەنا نایەڵم لە (...)ی منی ببڕی.

هەرچەندە کابرا زۆر ڕادەکات بەدوای پیرەیدا، بەلاّم نایگاتێ و ماندوودەبێ و دەکەوێ، ژنەی مەکربازیش فێڵەکەی سەری گرت و ئەوجارەش چێشتەکەی نەدا بەمێردەکەی و ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# لغاوی شەیتانی[1]

دەگێڕنـەوە دەڵـێن کابرایـەکی زۆر دەوڵەمەنـد دەبـێ، چـەندین سەرمەڕ و مانگا و سەدان جۆر حـەیوانی گـەورە و بـچووکی دەبـێ، بەڵام هەتا بڵێی کابرایەکی ڕەزیل و پیسکە دەبێ. هەرچـەند دەکـات دڵی نایە حەیوانێکی لە حەیوانەکانی بۆ خۆی سـەربڕێ. وەك دەڵـێن (شەیتان لغاوی کردووە).

ڕۆژێکـی بـۆ سـەروپێیان، چـەند شـار و دێ دەگـەڕێ، وە دەسـتی ناکەوێ. دوایی ڕوو لەچۆڵەوانییەك دەکا، دوور بەدوور دەبینێ ئـەوە گورگێکە بـەرەو ڕووی دێ و منداڵێکیـشی لـەزاری دایـە. هـەر بۆیـە هەڵمەتی بۆ دەبا و گورگەکە دەکوژێ و منداڵەکەی لێدەستێنێتەوە، ئنجـا دەسـتدەکاتەوە بەڕۆیـشتن. لـەڕێگا تووشـی عێلـی (جنـدان)[2] دەبـێ، بـەڵام نـازانێ کەئەوانـە جنـدن؟ چـونکە هـەروەکو ئینـسان

---

١- لغاو: دەمبەستێکی ئاسنە دەکرێتە ناودەمی ئەسپی خۆشڕەو بۆ ئەوەی سوارەکە دەسەڵاتی جووڵەی ئەسپەکەی لەدەست دەرنەچێ، هەرکەسێکیش ئەگەر ڕەزیل و پیسکە بوو وماڵی خۆی پێ نەخورا، واباوە پێی دەڵێن: شەیتان لغاوی کردووە، یان لغاوی شەیتانی لەسەرە.

٢- عێلی جندان: لە کۆندا و لە گێڕانەوەکاندا، زۆرجار بە (عێلی جەندان) ناوی جندۆکە (جنۆکە) دێ...



www.iqra.ahlamontada.com

خۆیـان نیـشان دەدەن، هـەر بۆیـە ئـەویش ڕوو لەیـەکێکیان دەکـا کەسواری کەرێك بووەو لێی دەپرسێ:

لەو مەملەکەتەی ئێوە چ باسە؟

کابراش دەڵێ: پاشای ئەو عێلەی ئێمە حـەوت سـاڵە ژنـی هێنـاوە، منداڵی نەبووە، ئەوساڵ منداڵێکیان بووە، کەچـی گـورك منداڵەکـەی فڕاندووە. ئەوە دەچین تا سۆراغێکی بکەین.

کـابراش ددڵـێ: وەڵـڵا مـن گورگەکـەم کوشـتووە و منداڵەکەشـم ڕزگارکردووە

کابرای سواریش دەڵێ: دەوەڵڵا ڕامەوەستە، خێـرا خـۆت بگەیەنـە ماڵی پاشای؟ چونکە خـەڵاتێکی زۆر باشـی دانـاوە بـۆ ئـەو کەسـەی کەمنداڵەکەی بۆ ڕزگاردەکا.

لێرەدا کابرای سوار (چونکە ئەویش یەکێکە لەعێلی جندان) دەزانێ کابرا بەدوای چیدا وێڵە و دەشزانێ خاوەنی چ سەروەت و سامانێکە، بەڵام لغاری شەیتانی لەسەر کـراوە و مـاڵی خـۆی پێنـاخورێ، بۆیـە پێی دەڵێ: ئەگەر چویە کن پاشایی و لێـی پرسـی لـەجیاتی ئـەوەی منداڵەکەمت ڕزگارکردووە لەماڵی دنیا چتدەوێ؟ ئەتۆ یەکسەر بڵـێ: ئەمن هیچم ناوێ تەنیا ماڵی خۆم بدەوە، ئەگەر لێی دووبـارە و سـێ بارەش کردیەوە، ئەتۆ هەر بڵێ: ماڵی خۆم دەوێ.

کابراش دەڵێ: زۆر باشە و پاشان بەرەو ماڵی پاشای دەڕوا.



www.iqra.ahlamontada.com

لەوێ نۆکەر کە دەبینن منداڵی پاشای ڕزگارکردووە، خەبەر دەدەنە پاشای و پاشاش یەکسەر داوادەکا بێتە ژووریّ.

دوای ئەوە کابرا دەچێتە ژووریّ و پاشا لەچۆنیەتی ڕزگارکردنی منداڵەکەی دەپرسیّ و ئەویش بۆی دەگێڕێتەوە. ئەوجا پاشا دەستخۆشی لێدەکا و دەڵێ: چتدەویّ لەماڵی دنیا بڵێ، تا بتدەمیّ؟

کابراش دەڵێ: پاشا ماڵی دنیا هیچم ناویّ؟ چونکە لەسایەی سەری ئێوە لەهیچم کەم نییە، ئەوەی دەمەویّ ئەوەیە کەماڵی خۆم دەوە. لێرەدا پاشا واقی وڕدەمێنیّ و داواکەی پێسەیردەبیّ، هەربۆیە لێی دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ: چتدەویّ تابتدەمیّ؟

کابراش هەر دەڵێ: هیچم ناویّ، بەس ماڵی خۆم دەوە.

بەقسان دەڵێن[1]: پاشا توورەدەبیّ و مستێکی لەپشتەملی کابرای ڕادەکێشیّ و دەڵێن لەوکاتەیدا (لغاو)ی شەیتانی لەزاری دێتە دەریّ... ئەوجا کابرا هەڵدەستیّ و دەڕوا. پاشان بیردەکاتەوە و دەڵێ: باشە بۆچی من ماڵی خۆم نەخۆم؟ ئەو سەروەت و سامانەی بۆ کێ بەجێبێڵم! لێرەدا کابرا دڵی دەگۆڕیّ و دەڕواتەوە بۆ ماڵیّ و یەکێك لەهەرە مەڕە قەڵەو وباشەکانی دێنیّ و سەری دەبڕیّ و بەشێکی دەبەخشێتەوە و بەشەکەی دیکەشی بۆ خۆی دەخوات و

---

١- واتە: وادەگێڕنەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

لـەو دڵـەڕاوكێ و ڕەزیلییـەش ڕزگـاری دەبێـت و ژیـانێكی ئاسـوودە دەباتە سەر، ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# شەیتان

دەگێڕنـەوە دەڵـێن : لەشـارێکی وەکـو ئـەو شـارەی پیـاوێکی دەوڵەمەنـد، بـۆ ئـەوەی بەحـسابی خـۆی، خـوای لـەخۆی ڕازیکـا، هەڵدەستێ، دەستدەکا بەخێر و خێراتێ. ڕۆژێکی جومعەی لەدەرکی مزگەوتێ ڕادەوەستێ، هەرچـی دێتـەدەرێ لەنوێـژێ پێیـدەڵێ: بڵـێ شـەیتان بەلەعنـەت بـێ. کـابراش هـەر ئەوەنـدەی گوتبـا، کـابرای دەوڵەمەند، توورەکەیەك پارەی دەدایە.

بـەڵێ، هەرچـی هاتـە دەرێ شـەیتانی بەلەعنـەت کـرد و توورەکـە پارەی خۆی وەرگرت. ئـەوەی مـابۆوە پیـاوێکی نـەزۆر پـیر ونـەزۆر جحێڵ، هاتەدەرێ و کابرای دەوڵەمەندیش گوتی:

دەی کاکە شەیتانی بەلەعنەتکە و پارەی خۆت وەرگرە.

کابراش گوتی: باشە بۆچی بە لەعنەتیکـەم؟! خـۆ مـن نەشـەیتانی دەناسم و نەدەمناسێ و هیچ خراپەیەکیشی بۆ نەبووم، بەس لەبـەر ئەو توورەکـە پارەیـەی، وەڵـڵا مـن بەلەعنـەتی ناکـەم و شـەیتانیش لەخۆم ناکەمە دوژمن.

بەڵێ کابرا شەیتانی بەلەعنەت نەکرد و ڕۆیـشتەوە بـۆ مـاڵێ. بـەڵام پـێش ئـەوەی بگاتـەوە مـاڵێ، شـەیتان خـۆی لێدەکاتـە زەلامێـك و



www.iqra.ahlamontada.com

سەرڕێی پێدەگرێ و لێی دەپرسێ: باشە بۆچی ئەتۆش وەك ئەو خەڵکەی شەیتانت بەلەعنەت نەکرد و توورەکە پارەی خۆت وەرنەگرت؟

کابراش گوتی: بۆچی بەلەعنەتی کەم، نەدەیناسم و نەدەمناسێ. قەتیش خراپەی بۆم نەبووە. ئنجا بۆچی لەخۆمی بکەمە دوژمن. شەیتان ئەو قسەیەی زۆر پێسەیر بوو. هەربۆیە بۆ ئەوەی دڵنیابێ لەقسەکانی، جارێکی دیکەش لێی دووبارەکردەوە بۆ ئەوەی شەیتانی بەلەعنەت بکا، کەچی ئەو هەر سووربوو لەسەر قسەی خۆی.

ئەوجا شەیتان بەکابرای گوت: مادام وایە، بۆئەوەی لەیەکتر ئاشکرابین، ئەوە ئەمن شەیتانم و چتدەوێ تا بۆت جێبەجێ بکەم؟

کابراش گوتی: ئەتۆ ئەگەر شەیتان بی، دەشزانی ئەمن بەدوای چدا وێڵم.

ئنجا شەیتان گوتی: ئێستا خۆم دەکەم بەئەسپێکی خۆشڕەو. وەرە سەر پشتم و بمبە بۆ مەیدانێ و بمفرۆشە و چۆنت پێخۆشە ئاوا وەسفم بکە و خەمت نەبێ...

کابراش ئەو مامەڵەیەی زۆر پێ سەیر و خۆش بوو، هەربۆیە سواری پشتی ئەسپەکە بوو و بردی بۆ مەیدانی مالاتی. لەوێ چەندی توانی وەسفی ئەسپەکەی کرد، بەوەش خەڵکی زۆری لێ خڕبۆوە و



www.iqra.ahlamontada.com

لەنێویاندا کابرای دەوڵەمەندیشی تێدا بوو. خەڵکەکە لەکابرایان پرسی، تیژڕەوی چۆنە؟

کابراش گوتی: چۆن پێتان خۆشە، ئاوایە. هەر بۆیە گوتیان: باشە تاقیدەکەینەوە، ئەگەر بەو شێوەیەبوو کەتۆ دەیڵێی، ئەوە چەندی بڵێی دەتدەینێ.

کابراش گوتی: مەناعەتم نییە، چ دەڵێن وادەکەین.

ئەوجا کابرا گوتی: باشە ئەو پەیامەی بەسەعاتێکی بگەیەنە پاشای و وەرەوە، قبوڵمانە.

کابراش گوتی: ئەوە زۆر ئاسانە و سواری ئەسپەکەی بوو و وەڕێ کەوت، وەختێکی گەیشتنە چۆڵەوانیەکی، شەیتان بەکابرای گوت: ئەتۆ دابەزە، ئەلێرە چاوەڕێمکە، ئێستا دێمەوە. کابراش دابەزی و شەیتانیش لەچاوان ونبوو، هەرئەوەندەی بڵێی شەیتان گەیشتەوە جێ و ئیشەکەی جێبەجێکردبوو و بەکابرای گوت: زەرە سەرکەوە، وەختێکی چوونەوە مەیدانێ نیوەی سەعاتەکەش نەڕۆیبوو! ؟ ئنجا خەڵکەکەی لەوێبوو کەوتنە ڕق بەرقە لەسەر کڕینی ئەسپەکەی. تاوای لێهات زۆرترین پارە، کابرای دەوڵەمەند بوو کەپارەی دەدا بەخەڵکی تا شەیتانی بەلەعنەت بکەن. کابراش پارەی خۆی لەدەوڵەمەندەکە وەرگرت و جڵەوی ئەسپەکەی تەسلیم بەکابرای کرد



www.iqra.ahlamontada.com

و لێیدا ڕۆیشت. ئەوجا کابرای دەوڵەمەند ئەسپەی بردەوە و کا و جۆی بۆ دانا و خزمەتێکی باشی کرد.

بەڵێ دەنگوباسی ئەو ئەسپەی بەشاریدا بڵاوبۆوە و هەرچی خەڵك بوو تامەزرۆی دیتنی ئەو ئەسپەی دەکرد، زۆریان داوا لەکابرای دەوڵەمەند کرد کەئەسپەکەی بێنێتە دەرێ و بیبینن. ئەوجا کابرا قەناعەتی کرد و چوو بۆئەوەی ئەسپەکەی بێنێتە دەرێ و بیبینن. بەڵام وەختێکی دەچێ ئەسپ لەشوێنی خۆی نەماوە و دەستدەکات بەهات و هاوار و دەڵێ:

ئەسپەکەیان دزیوم، ئەوجا دەبێتە مقۆمقۆ و دەچن بۆ ماڵی کابرای ساحێب ئەسپ و دەڵێن: ئەسپەکە نەماوە و ئەتۆ دەزانی بۆ کوێ چووە؟!

کابراش دەڵێ: کابرا ئەتۆ شێت بووی، ئەمن لەبەرچاوی خەڵکیم جڵەوی ئەسپەکەی نەدایە دەستت. کابراش دەڵێ: با، بەڵام لەژووری بوو، دەرگاشم لەسەر داخستبوو، کەچی دیارنەماوە.

کابرای خاوەن ئەسپیش دەڵێ: ئنجا من چبکەم، بزانە کێ دوژمنتە ئەو دزیویەتی.

کابراش دەڵێ: کەسم دوژمن نییە، تەنها شەیتان نەبێ و منیش هاتمەوە و هیچیان نەدامێ.



www.iqra.ahlamontada.com

# شاژنی عەیار

دەگێڕنەوە دەڵێن پاشایەك دەبێت ژنێكی عەیار و جوانی دەبێ، ئەو پاشایە قەزاوقەدەر دەچێتە بەر ڕەحمەتی خوا. پاشاژنیش، زۆر پاشا دەچنە داوای، مێردی بەكەس ناكا. ڕۆژێكی هەیاس و سوڵتان مەحموود و حەسەن مەمەند پێكەوە دەچنە داوای، ئەو ژنە پاشایەش دەڵێ: هەر كەسێك بتوانێ ئەوشەو دووجارم لەخەوێ هەستێنێ، مێردی پێدەكەم، دەنا دەیگرم و لە زیندانی دەكەم. بەڵێ ئەو شەوەی سوڵتان مەحموود گوتی: ئەمن ئەو شەو لەخەوێی هەڵدەستێنم.

بەڵێ دوای ئەوەی ژنە دەچێتە سەرجێیە، سوڵتان مەحموود هەست ڕادەگرێ، وەختێكی دەزانێ ئەوە ژنە خەوی لێكەوتووە، بانگی دەكات و دەڵێ:

شاژن هەستە لەخەوێ.

ئنجا شاژن دەڵێ: ئاوا هەڵمدەستێنی! بانگدەكاتە نۆكەرانی و دەڵێ: وەرن بیگرن.

بەڵێ سوڵتان مەحموودی دەگرن و بۆ شەوی دوایی حەسەن مەمەند دێت و دەڵێ ئەمن هەرچۆنێك بێت ئەوشەو لەخەوێی هەڵدەستێنم.



www.iqra.ahlamontada.com

بـەڵێ حەسـەن مەمەنـد هەسـت ڕادەگـرێ و هـەر کـەدەزانێ ژنـە خەریکـە بـچێتە سـەر جێـی، خـۆی لێـدەگرێ و وەختێکـی خـەوی لێدەکەوێ، حەسەن مەمەند هاواردەکات و دەڵێ:

پاشام هەستە لەخەوێ، ژنەش هەڵدەستێ و دەڵێ: ئـاوام لەخـەوێ هەڵدەستێنی! بانگدەکاتە نۆکەرانی و دەڵێ: وەرن بیگرن.

بەڵێ ئەویش دەگرن و دەیبەنـە کـن سـوڵتان مـەحموودی و ئـەوجا سەرەی هەیاسی دێت.

بۆ شـەوی سـێیەم هـەیاس دێـت و لـەبن سۆبەی بەرامبـەر شـاژنی دادەنیـشێ و خـۆی دەخافلێنـێ هـەتا ژنـە خـەوی لێدەکـەوێ یـان ناکەوێ.

هەیاس دەڵێ: بەتانی خـانمێ، حیکایـەتێکی خۆشـم بـۆ ناگێڕیـەوە خەوم نایە.

ئـەوجا بـەتانی دەڵـێ : گوێـت لـێبێ هـەیاس نەزیلەیـەکت بـۆ بگێڕمەوە:

ژنێکم دەناسـی زۆر ئاقـڵ و وریـا و سـەرناس بـوو، هـەر وەختێکـی چـووبایە نێـو حـەیوانان، یـەك بەیـەکی ئـەو حەیوانانـەی دەناسـی، مێردەکەی و شوبرایەکەشی شوان دەبن. ڕۆژێکی ژنە دەچـێتە جێـی مۆڵی[1] حەیوانان و دەبینێ نەمێردەکەیی و نەشـووبرایەکەی لـەکنیان

---

١- جێی مۆڵی: ئەو شوێنەی کەمەڕ و ماڵات لێی دەحەسێنەوە و کاوێژی تێدا دەکەن.



www.iqra.ahlamontada.com

نین. زۆر هاواردەکات، کەسیان جواب نادەنەوە و ژنەش دەگەڕێ تادەگاتە سەر کانییەکی. دەبینێ ئەوە مەیتی مێردەکەیی و شووبرایەکەی لەوێ کەوتوون و سەریان لێکراوەتەوە...

بەڵێ ژنە زۆر دەگریا و لەخۆدەدا بێ فایدەیە. ئەوجا هەڵدەستێ دەست و چاوان بشوا، سەیردەکا ئەوە بۆقێك سەری لێبۆتەوە و بۆقێکی کە خەریکە بەقەوزەی، چاکی دەکاتەوە و سەری بەقالبیەوە دەخاتەوە، ئەوجا ژنەش هەڵدەستێ قەوزەیەکی زۆر دەیەنێ و دەیکوتێ و دەینێ لەسەری مێردەکەی و شووبرایەکەی، بەڵام لەپەلەپەلیان سەری مێردەکەی بەشووبرایەکەیەوە دەنێت و سەری شووبرایەکەی بەمێردەکەیەوە دەنێت. وەختێکی شووبراو مێردەکەی چاکدەبنەوە، دەبێتە مشتومڕیان کەژنە ئی کامیانە؟! دەنگیان لێك بەرزدەبێتەوە...

هەیاسیش دەڵێ : ئی لەشەکەیە. بەتانیش دەڵێ: چۆن ئی لەشەکەیە؟

هەیاس دەڵێ: لەش بەشە گەورەکەیە و سەر هیچ نییە.

لەو مشتومڕەیدا ژنە بەخەبەر دێت و دەڵێ: ئاخر چۆن ئی لەشەکەیە؟ لەش چییە هەر سەر حسابە و ئی سەرەکەیە.

ئەوجا هەیاس گوتی: خانم ئەوە جارێکم لەخەوێ هەستاندی.

ژنەش گوتی ڕاست دەکەی و نووستەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

وەختێکی هەیاس هەستیکرد ژنە خەوی لێکەوتۆتەوە، ڕووی لەدۆشەکی خانمی دەکا و دەڵێ :

دۆشەکی خانمێ شەو درەنگە و خەوم نایە، حیکایەتێکم بۆ ناگێڕیەوە ؟

ئەوجا دۆشەك دەڵێ : هەیاس گوێت لێبێ:

دەگێڕنەوە دەڵێن جارێکی دارتاشێك و خەیاتێك و مەلایەك کە کەرێکی پێدەبێ، پێکەوە لەلێڕەوارێکیدا شەوێ دەمێننەوە و مەلا ناچاریان دەکا، دەبێ ئێشکەی[1] لەکەرەکەی بگرن. بەڵێ خەیات و دارتاش ڕازی دەبن.

دارتاش دەڵێ: دەباشە ئێستا ئێوە بنوون من حەرەسیاتی دەگرم. ئەوجا خەیات و مەلا دەنوون. دارتاشیش بۆ ئەوەی بێتاقەتی خۆی دەرکا، دەستدەکا بەدارتاشین و تا سەرەی حەرەسیاتی تەواودەبێت، لەداران کچێکی جوان دادەتاشێ، تا ئەوەش دەکا، سەرەی حەرەسیاتی تەواودەبێ و دەچێ خەیاتی هەڵدەستێنێ، بەڵام ئەوەندەی خەودێ ڕاناوەستێ تاخەیات هەڵدەستێ و خەوی لێدەکەوێ. وەختێکی خەیات هەڵدەستێ تەماشادەکا ئەوە زەلامێك لەکن کەرەکەی ڕاوەستاوە، هەرچەند خەیات دەنگی دەدا، کابرا

---

١- ئێشکە: پاسکردن، ئاگالێبوون.



www.iqra.ahlamontada.com

جواب ناداتــەوە! ئنجا خــەیات لێـی نزیـك دەبێتــەوە و تەماشـادەکا ئەوە کچێکی جوانە و لەدار داتاشراوە و دەڵێ:

هــەبێ و نــەبێ ئــەوە ئیشی دارتاشـیە. وەڵلاهــی ئــەمنیش ئێـستا دەستێك جلکی جوانی بۆ دەدوورم. بەڵێ ئەوجا خــەیات هەڵدەسـتێ و دەستدەکا بــەجل دوورین و کـچەکەی دەڕازێنێتــەوە، تـا ئــەوەش ددکا سەرەی حەرەسیاتی تەواودەبێ و دەچێ مەلای هەڵدەستێنێ. ئەویش ئەوەندەی خەودێت ڕاناوەستێ تـا مـەلا هەڵدەستێ خــەوی لێدەکــەوێ. وەختێکــی مــەلا هەڵدەســتێ و چــاوان دەگلۆفــێ، تەماشادەکا ئەوە کابرایەك لە کن کەرەکـەی ڕاوەسـتاوە، هـەر بۆیـە مەلا هاوار دەکا و دەڵێ :کاکە ئەو کەرەی بـۆ کـوێ دەبـەی؟ بەسـێ کەسان ئـەو کـەرەمان پێیـە؟ کـابرا هـیچ جـواب ناداتـەوە و مـەلاش لەناخافڵ، لەپشتەوە مەترەقێکی لەپـشتملی کابرایددا. وەختێکـی دەبینێ ئەوە تەختەدارێکی ڕەق و تەقە، ئــەوجا مـەلا دزانـێ ئــەوە ئیـشی دارتــاش و خەیاتیــە. بۆیــە ئــەویش هەڵدەسـتێ دەسـتنوێژێ هەڵدەگرێ و دەستدەکا بەنوێژکردنێ و سەردەباتە سەر سوجدەی و دەڵێ:

وەڵلاهــی هــەتا ئــەو ژنــە بەدەســتی خــۆی هەڵمنەسـتێنێ ســەر لەســوجدەی هــەڵناگرم. بــەڵێ هــەتا ڕۆژ دەبێتــەوە مــەلا ســەر



www.iqra.ahlamontada.com

لەسوجدەی هەڵناگریٚ و بەعەمری ئەو خوایەی کچە ڕووحی دیٚتە بەر و دەڵیٚ:

هەستە مەلا ڕووحم هاتۆتەبەر! لەو قسانەدا دەبن دارتاش و خەیاتیش بەخەبەردیٚن و هەریەکە و کچەی بە ئی خۆی دەزانیٚ. مەلاش دەڵیٚ: ئەوەی پیٚناویٚ، بابچین شەرعی بکەین. بەڵیٚ، دەچنە مەحکەمەی و لەویٚ یەك دەڵیٚ ئی دارتاشیە و یەك دەڵیٚ ئی خەیاتیەو بەلای مەلایدا هەرناچن.

ئەوجا هەیاس دەڵیٚ: بەهەموو شەرعان ئی دارتاشیە.

دۆشەکیش دەڵیٚ: ئی خەیاتیە. لەو دەنگەدەنگەیدا ژنە بەخەبەر دیٚ و لەخەفەتان دۆشەکەکەی بن خۆشی فڕیٚدەدا و دەڵیٚ: ئاخر چۆن مەحکەمە وادەکریٚ؟! دارتاش داری خۆی دەباتەوە و خەیاتیش جلوبەرگی خۆی دەباتەوە، ئەوەی دەمیٚنیٚتەوە لەش و ڕووحەکەی ئەویش ئی مەلایە.

ئەوجا هەیاس دەڵیٚ: خانم ئەوە دوو جارم هەستاندی.

خانمیش دەڵیٚ: ڕاستدەکەی و ئەوجا لەدوای مەلای دەنیٚرن و ژنەی لەهەیاسی مارەدەکەن و هەیاسیش سوڵتان مەحموود و حەسەن مەمەندی لەزیندانیٚ دیٚنیٚتە دەریٚ و پیٚك شاد دەبنەوە و ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامیٚ.



www.iqra.ahlamontada.com

# سوڵتان مەحموود و ژنەکانی

ڕۆژێك هەیاس و سوڵتان مەحموود پێکەوە لەشاری دەچنە دەرێ. هەیاس لەدوورەوە چاوی بەکابرایەکی جووتیار دەکەوێ، خەریکی جووتییە. ئەو کابرا جووتیارە لەهەموو سەرەخەتان[1] جارێك خۆی هەڵدەدات، هەیاس پێی سەیردەبێ و زەردەیەکی دێتێ...

سوڵتان مەحموود دەڵێ: چییە هەیاس بەچی پێدەکەنی؟

هەیاس دەڵێ: سەیری ئەو کابرایەی کە، دیارە دڵی زۆر خۆشە بۆیە لەهەموو سەرەخەتان جارێك خۆی هەڵدەدا.

سوڵتان تووڕەدەبێ و دەڵێ: دەبێ بزانم بۆچی وادەکا؟ هەربۆیە لە کابرای جووتیار نزیك دەبێتەوە و لێی دەپرسێ: چییە کابرا شێت بووی، خێرە لەهەموو سەرەخەتان جارێك خۆت هەڵدەدەی؟

---

١- سەرەخەت: سەرەتای خەتی جووتکردن. هەموو زەوییەك کەجووتیارێك خاوەنیەتی، سنوورێکی دیاریکراوی هەیە، لەکاتی جووتکردندا لە سەرەتای سنوورەکەی خۆیەوە دەستدەکات بەجووتکردن تاکوو کۆتایی، کەئەویش بە چەند خەتێکی گاسنەکە زەوییەکە دەکێڵێ، واتە چەند زەوییەکەی فراوانتربێ، ئەوەندەی سەرەخەتی زۆرترە.



www.iqra.ahlamontada.com

کابرای جووتیاریش دەڵێ: سوڵتانی بەڕێز، بۆیە خۆم هەڵدەدەم، چونکە دڵم خۆشە.

سوڵتان دەڵێ: ئاخر بەچی دڵت خۆشە، تۆ کە زەوی دەکێڵی.

کابرای جووتیاریش دەڵێ: ژنێکی زۆر ئاقڵ و ژیرم هەیە و زۆریشی خۆش دەوێم و زۆریش لەگەڵم چاکە.

ئەوجا سوڵتان ڕوو لەهەیاسی دەکا و دەڵێ: ئەو ژنەی لێدەستێنم.

ئەوجا سوڵتان بەکابرای جووتیار دەڵێ: بۆ نایەی سەودایەکی بکەین.

کابرای جووتیار دەڵێ: سەودای چۆن؟

سوڵتان دەڵێ: من سێ ژنم هەیە، هەر سێ ژنەکانمت دەدەمێ، بەو شەرتەی تۆش ئەو ژنەی خۆتم بدەیەی.

کابرای جووتیار یش دەڵێ: سوڵتان من سەودای واناکەم.

هەرچۆنێکی بێ سوڵتان بەخۆشی یان بەزۆر، ژنەی لەکابرای جووتیار دەستێنێ و لەجێگایدا هەر سێ ژنەکەی خۆی لەکابرای مارە دەکات، کابراش بەناچاری هەرسێ ژنەکان لەگەڵ خۆی دەباتەوە. بەڵام پێش ئەوەی بیانباتەوە بۆ ماڵێ، دەیانباتە سەر زێیە، بەو بیانووەی کەماڵی لەوبەری ئەو ڕووبارەیە، ئەوجا دەستدەکا بە پەڕاندنەوەیان و پێیان دەڵێ: دەبێ یەک بەیەک بتان پەڕێنمەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

ژنەکانیش دەڵێن: باشە.

ئـەوجا کـابرای جووتیـار دەسـتی یـەکێکیان دەگرێـت و دەیباتـە ناوەڕاسـتی ئـەو ڕووبـارەی. لـەوێ لێـی دەپرسـێ: سـوڵتان بۆچـی ئەتۆی نەویستووە؟

ژنەش دەڵێ: وەڵڵا ئەمن دزم.

کابرای جووتیار دەڵێ: قەیناکە ئەتۆ چاك دەبی، دەیپەڕێنێتەوە.

دوای ئەوەی کابرا ژنی یەکەمی پەڕاندەوە، گەڕایەوە بۆ ژنی دووەم و ئەویشی هێنا تا ناوەڕاستی ڕووبارەکەی و هەمان پرسیاری لەویش کرد، کە بۆچی پاشا نەیویستووە؟

ژنەش دەڵێ: وەڵڵا ئەمن (ح...م).

کـابرای جووتیـاریش دەڵـێ: هـیچ نییـە ئـەتۆش چـاك دەبـی و دەیپەڕێنێتەوە. پاشان دەگەڕێتـەوە و دەچـێ ژنـی سـێیەم دێنـێ و لەناوەڕاستی ڕووبارەکە هەمان پرسـیاریش لـەژنی سـێیەم دەکـات و دەڵێ: پاشا بۆچی ئەتۆی نەویستووە.

ژنی سێیەمیش دەڵێ: وەڵڵا ئەمن زماندارم.

کـابرای جووتیـاریش دەڵـێ: مـادام زمانـداری، ئـەتۆ چـاك نـابی و یەکسەر دەیخاتە ڕووبارەکەوە، پاشان بۆ خۆشی دەپەڕێتەوە.

ئەوجا هـەردوو ژنەکـەی دەباتـەوە و دوو ماڵیـان بـۆ دادەنـێ، بـەو ژنەی کەدەیگوت (دزم) دەڵێ:



www.iqra.ahlamontada.com

ئەو ماڵە ئـی تۆیـە، ئـەوەش کیلـۆ و تـەرازو و بـۆ کـوێی دەدزی و دەیبەی بیبە، کەیفی خۆتە. بەو ژنەش کـە دەیگـوت (ح..م) دەڵـێ: ئـەوە مـاڵی خۆتـە و دوو دەرگاشـی تێدایـە، لەگـەڵ کێـت پێخۆشـە ڕابـوێرە، بـەڵام ئەگـەر مـن بـەو دەرگایەیـدا هاتمـەوە، تـۆ کـابرای بەدەرگای دووەمدا بەڕێبکە.

بەو شـێوەیە ژنـەکان ماوەیـەك گوزەرانـدیان، بـەڵام دوایـی بیریـان کردەوە و لەخۆیان پرسی: باشـە مـادام کـابرا دڵـی ئەوەنـدە باشـە، بۆچی ئێمە ئەو کارانە بکەین، بۆیە بڕیاردەدەن خۆیان چاکبکەن.

دوای ئەوەی کەژنەکانیش چاکبوون، کابرای جووتیار ڕۆیشتەوە بـۆ سەر زەوییەکەیی و دەستیکردەوە بە جووتکردن، بەڵام ئەوجارەیان لەجیاتی جارێك دووجار خۆی هەڵدەدا.

وەختێـك هـەیاس و سـوڵتان مـەحموود جـارێکی دیکـە بەوێـدا تێدەپەڕن، هـەیاس چـاوی بـەکابرای جووتیـار دەکـەوێت و دەبینـێ ئەوجارەیان لەجیاتی جارێك دووجـار خـۆی هەڵـدەدات، زەردەیـەکی دێتێ... سوڵتان مەحموود سەیرێکی هەیاس دەکات و دەڵـێ: چییە دیسان هەیاس بەچی پێدەکەنی؟

هەیاسـیش دەڵـێ: تەماشـای ئـەو کابرایـەی کەژنەکـەت لێـستاند، جاران لە هەموو سەرەخەتان جارێـك خـۆی هەڵـدەدا، کەچـی ئێـستا دووجار خۆی هەڵدەدا.



www.iqra.ahlamontada.com

سوڵتان تووڕەدەبێ و لە کابرای جووتیار نزیک دەبێتەوە و لێی دەپرسێ: بۆچی لەهەموو سەرەخەتان دووجار خۆت هەڵدەدەی؟

کابراش دەڵێ: قوربان جاران کە ژنێکی چاکم هەبوو، جارێک خۆم هەڵدەدا، بەڵام ئێستا دوو ژنی چاکم هەیە، بۆیە دووجار خۆم هەڵدەدەم.

سوڵتان دەڵێ: ژنەکانی من دەڵێی؟

کابرا دەڵێ: بەڵێ قوربان.

سوڵتان دەڵێ: چۆن چاکبوون؟

کابرا دەڵێ: ئاخر قوربان من بەشێوازی خۆم پەروەردەم کردوون و سەربەستی تەواوم دانێ لەئیشەکەیان، بۆیە چاکبوون.

سوڵتانیش دەڵێ: دەوەڵڵا ئەو ژنەی کەلەتۆم ستاند، ئێستا دزیشە و (ح..ن)یشە و زمانداریشە.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

# ئەگەر مەگەر

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورەتر نەبوو، دەگێڕنەوە دەڵێن: هەیاس و سوڵتان مەحموود و حەسەن مەمەند، بەشەوێ دەچنە شاری غەزنەی و زۆر دەگەڕێن بەناو ئەو شارەیدا، لەشوێنێکی لاچەپەکدا تەماشادەکەن ئەوە لۆکزێك دایسێ[1] و ژنێکیش خەیاتی دەکا.

وەختێکی لێی نزیك دەبنەوە، سوڵتان مەحموود دەڵێ: دەچم، بزانم مێردم پێناکا؟

بەڵێ سوڵتان دەچێ و دادەنیشێ، کچەش دەزانێ نیازی خراپە، هەڵدەستێ مقەستێك و پارچە قوماشێك و چەقۆیەك و سێوێکی بۆ دادەنێ و دەڵێ:

مەعنای ئەوانەم بۆ لێکبدەوە، مێردت پێدەکەم.

سوڵتان مەحموودیش چەند سەری خۆی دێنێ و دەبا، نازانێ چی بکا و چۆن مەعنایان لێکبداتەوە. بۆیە ناچار دێتە دەرێ و چەند لێی دەپرسن چی بوو؟ جوابیان ناداتەوە.

---

١- دایسێ: دادەگیرسێ، بەلام لێرەدا بەمانای (ئیشدەکا) دێ.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوجا حەسەن مەمەند دەڵێ: ئەمن دەچم. دوای ئەوەی دەچێ، کچەکە هەمان پرسیاریش لەحەسەن مەمەند دەکا، ئەویش هیچ سەری خۆیان لێدەرناکا و ناچار دێتە دەرێ. پاشان هەیاس دەڵێ: وەڵڵاهی ئەمنیش دەچم، بزانم چی دەبێ. دوای ئەوەی هەیاس دەچێتە ژوورێ، کچەکە بەهەمان دەستوور، پرسیار لە هەیاسی دەکا، هەیاسیش بەبێ دەنگی بەمقەستەکەی قوماشەکەی دەبڕێ و بەچەقۆیەکەش سێوەکەی دوو لەتدەکا.

ئەوجا کچەکە دەڵێ: ئەگەر. هەیاسیش دەڵێ: مەگەر. یەعنی مەگەر سوڵتان بمکوژێ دەنا ئەو سڕەی پێ ناڵێم، دوایی بەبێ دەنگی دێتە دەرێ، بەڵام سوڵتان وازی لێناهێنێ و پێی دەڵێ:

ئەگەر پێم نەڵێی دەتکوژم.

هەیاسیش دەڵێ: ئەگەر بشمکوژی، پێت ناڵێم.

ئەوجا سوڵتان بانگی نۆکەرانی دەکات و دەڵێ: بڕۆن هەیاسی بەرن بە قەنارەیداکەن.

بەڵێ هەیاسی دەبەن و بە قەنارەیدادەکەن، کچەش کەدەزانێ سوڵتان بەنیازە هەیاسی لەقەنارە بدا، دێ بە بەردەمی هەیاسیدا دەڕوا و هەنارێکی بەعەرزیدا دەدا و دەڕوا، ئەوجا هەیاس دەڵێ: لێم کەنەوە، قسان دەکەم.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵێ نۆکەرەکان هەیاسی دێننە خواریێ و سولْتانیش دەڵێ: ها هەیاس چییە بۆ قسان ناکەی؟

هەیاسیش دەڵێ: قوربان ئەو کچە داوای وەعدی ڕاستی دەکرد کەسرِی خۆشەویستییەکەی لای کەس باسنەکەی، هەر بۆیە ئەو مقەست و قوماش و سێو و چەقۆیەی دانابوو، ئەویش یەعنی دەبێ وەعدم بدەیە و بڵێی: ئەگەر وەك ئەو قوماشەی لەتلەتم کەن یان وەك ئەو سێوەی وەبەر چەقۆیانم دەن، ئەو سرەی ئاشکراناکەم و خیانەتت پێناکەم، کە هاتیش بە بەردممدا و ئەو هەنارەی فرێدا و بوو بەهەزار پارچە، یەعنی قسان بۆ سولْتانی بکە، با حەیای من وەکو ئەو هەنارەی برِژێ، بەڵام تۆ لەقەنارە نەدرێی.

دوایی سولْتان دەڵێ: وەڵلاهی لێت خۆشدەبم، بەڵام بەشەرتێکی، ئەگەر ژنێکی وەکو ئی خۆت ئاقڵم بۆ پەیداکەی.

دوای ئەوەی هەیاس ئەو کچەی دێنێ، ڕۆژێك سولْتان لێی دەپرسێ: ها هەیاس چتکرد، بۆت پەیدانەکردم.

هەیاسیش دەڵێ: خەمت نەبێ سولْتان، هەر بۆت پەیدادەکەم. ئنجا بۆ سبەینێ هەیاس هەڵدەستێ دەوری ماڵەکەی خۆی هەڵدەقەنێ و قیری تێدەکا و دوایی دەڕوا.

بۆ شەوێ سولْتان مەحموود دەزانێ هەیاس لەماڵێ نییە، دەچێتە ماڵیان، ژنی هەیاسیش چونکە ژنێکی ئاقڵ دەبێ، فەرمووی سولْتانی



www.iqra.ahlamontada.com

دەکا و سوڵتانیش دەچێ دادەنیشێ. ئنجا ژنی هەیاسی هەڵدەستێ سێ هێلکەی بۆ سوڵتانی دەکوڵێنێ و هەرسێکیان ڕەنگ دەکا، یەک سوور و یەک ڕەش و یەک سپی و دەیهێنێ و لەپێش دمی سوڵتانیان دادەنێ. دوای ئەوەی سوڵتان هەرسێ هێلکەکەی دەخوا، ژنی هەیاسی لێی دەپرسێ: سوڵتان لەو سێ هێلکانەی خواردت، کامیان تامی خۆشتر بوو؟

سوڵتانیش پێدەکەنێ و دەڵێ: وەڵڵا بڵێم چی، هەموو یەک تامیان هەبوو.

ژنی هەیاسیش دەڵێ: دەوەڵڵاهی ژنیش هەمووی هەر یەک تامیان هەیە و بەخۆڕایی خۆت هەڵمەخەڵەتێنە.

سوڵتان بەو قسەیەی زۆر تێکدەچێ، هەر بۆیە بەدڵشکاوی دێتە دەرێ و دەڕواتەوە بۆ ماڵێ.

دوای ئەوەی هەیاس دەڕوا و لەو مەملەکەتەی دەچێتەدەر، لەڕێیە لەگەڵ کابرایەکی پیر دەبێ بەبرادەر، دوای هەواڵ پرسینی یەکدی، دەستدەکەنەوە بەڕۆیشتن تاتووشی هەورازێکی دەبن.

هەیاس دەڵێ: دەڵێی چی خاڵی خۆم لەو هەورازەی قادرمان دروستکەین؟



www.iqra.ahlamontada.com

کابراش لەمەبەستی هەیاس تێ ناگا و دەڵێ: بەخوا بێ ئەقڵی ڕۆڵە، بەو دەم ودەستەی و لەو هەورازەی قادرمە چۆن دروستدەکرێ؟

هەیاسیش سەرێکی بۆ ڕادەوەشێنێ و دەستدەکاتەوە بەڕۆیشتن و هەر چۆنێکی بێ، هەورازەکەی دەبڕن و ئەوجا شۆڕدەبنەوە و وردە وردە دەڕۆن، تادەگەنە ڕووبارێکی.

ئەوجا هەیاس دەڵێ: دەڵێی چی خاڵە لەسەر ئەو ڕووبارەی پردێکی دروستکەین؟

دیسان کابرا لەمەبەستی هەیاس حاڵی نابێ و دەڵێ: ڕۆڵە شێت بووی، بەڕێڕەوی چۆن پرد دروستدەکرێ؟

بەڵێ دوای ئەوەی لەو ڕووبارەی دەپەڕنەوە، سەرلەنوێ دەستدەکەنەوە بەڕۆیشتنێ و قسەوباسی دنیایە، تا دەگەنە نزیکی ئەو ئاواییەی ماڵی کابرای لێیە، لەوێ تووشی پەڵە گەنمێکی جوان دەبن.

وەختێکی تێی ڕادەمێنن سەریان لەجوانی ئەو گەنمەی دەسوڕمێ، بۆیە کابرا دەڵێ: بەخوا گەنمێکی جوانە !

هەیاسیش دەڵێ: ئەگەر کابرا بەشینی نەیخواردبێ، زۆر جوانە !

کابراش دەڵێ: بەخوا کابرایەکی سەیرە، گەنم چۆن بەشینی دەخورێ؟



www.iqra.ahlamontada.com

هەیاسیش سەرێکی بۆ دەلەقێنێ و دەستدەکەنەوە بەڕۆیشتنێ تادەگەنە ناو ئاوایی و کابرا بەهەیاسی دەڵێ: بۆ کوێ دەچی؟

ئەویش دەڵێ: ئەتۆ نامزگەوت!

کابرا لەمەبەستی هەیاسی تێناگا و خواحافیزی لەهەیاسی دەکا و دەڕوا. هەیاسیش ڕوو لەمزگەوتێ دەکا.

ئەو کابرایەی ڕەفیقی هەیاسی، کچێکی جوان و ئاقڵی دەبێ. وەختێکی بابی دەگاتەوە ماڵێ، لێی دەپرسێ: چت دی، چت نەدی؟

کابراش دەڵێ: وەڵڵا نازانم چت بۆ بگێڕمەوە؟ لەهاتنەوەمدا تووشی کابرایەکی ئەوەندە بێ ئەقڵ بووم...

کچەکەی دەڵێ: چۆن؟

ئەویش دەڵێ: ئنجا بڵێم چۆن؟ لەڕێیە دەهاتینەوە، تووشی هەورازێکی بووین، گوتی: دەڵێی چی خاڵە قادرمان لەو هەورازەی دروستکەین. دوایە تووشی ئەو ڕووبارەی خۆمان بووین، گوتی: با پردێکی دروستکەین، ئنجا وەختێکی نزیکی ئاوایی بووینەوە، تووشی پەڵە گەنمێکی جوان هاتین، ئەمن گوتم: زۆر جوانە! کابراش گوتی: ئەگەر بە شینی نەخورابێ، گەنمێکی جوانە. ئەمنیش گوتم بەخوای سەیری، گەنم چۆن بەشینی دەخورێت؟

ئەوجا کچەکەی گوتی: بابە ئەو کابرایە زۆر لەمن و لە تۆش ئاقڵترە؟



www.iqra.ahlamontada.com

بابی کچەی گوتی: چۆن وا دەڵێی؟

کچەش گوتی: ئەگەر گوتوویەتی با لەو هەورازەی قادرمان دروستکەین، مەخسەدی ئەوە نەبووە قادرمان دروستکەن، مەخسەدی ئەوە بووە کەوردە وردە قسان بکەین و سەرکەوین، پاشان ئەگەر تووشی ڕووبارەکەی بوون وگوتوویەتی: با پردێکی دروستبکەین، مەخسەدی ئەوە نەبووە کەپردی دروستبکەن، مەخسەدی ئەوە بووە کەدەستی یەك بگرین، ئنجا بپەڕینەوە، ئەگەر یەکیشمان بکەوێ، ئەوی دی دەتوانێ ڕاستیکاتەوە، دوایەش کەتووشی پەڵە گەنمەکەی بوون و گوتوویەتی ئەگەر کابرا بەشینی نەیخواردبێ، مەخسەدی ئەوە نەبووە کەکابرا گەنمەکەی بەشینی خواردبێ، بەڵکومەخسەدی ئەوە بووە کەئەگەر کابرا پێشتر پارەی لەسەر قەرز نەکردبێ و نەیخواردبێ.

ئەوجا کچە دەڵێ: بابە ئەی کوا بۆ کوێ چوو؟

ئەویش دەڵێ: گوتی: ئەتۆنا مزگەوت!

کچەش دەڵێ: ڕاستدەکا، ئەگەر تۆ خولقی نەکەی و فەرمووی نەکەی، ناچارە بچێتە مزگەوت.

دوایی کچە هەڵدەستێ، (١٢) هێلکە و (٣٠) نانی بۆ دەخاتە ناو توورەکەیەك و بەنۆکەرێکی خۆیاندا بۆی دەنێرێتە مزگەوت. ئەو



www.iqra.ahlamontada.com

نۆکەرەش لەرێیە نان و هێلکەیەکی لێدەخوا و ئەوەی کەش دەبا بۆ هەیاسی.

وەختێکی هەیاس توورەکەکەی دەکاتەوە و هێلکە و نانەکان دەبژێرێ، بەکابرای نۆکەر دەڵێ:

ئێوە ساڵتان (١١) مانگە و مانگیشتان (٢٩) ڕۆژە؟ دوایی دەستهەڵدەگرێ و دەڵێ: ناخۆم برسیم نییە، بیانبەوە. ئەوجا کابرای نۆکەر هەڵدەستێ نان و هێلکەکان لەتوورەکەی دەهاوێتەوە و دەڕواتەوە بۆ ماڵێ و قسەکانی هەیاسی بۆ خاتوونی دەگێڕێتەوە.

ئنجا کچە دەڵێ: دیارە لەهێلکە و نانەکەت خواردووە، بۆیە نەیخواردووە.

کابرای نۆکەریش دەڵێ: ئەرێوەڵڵا.

ئەوجا کچە دەڵێ: دەبێ هەرچۆنێکی بێ ئەو کابرایەی بێنیەوە ببینم.

ئنجا کابرای نۆکەر دەچێتەوە بۆ مزگەوت و بەهەیاسی دەڵێ: خاتوون دەیەوێ چاوی پێتان بکەوێ.

هەیاسیش دەڵێ: زۆر باشە و لەگەڵ کابرای نۆکەر دەڕواتەوە بۆ ماڵێ.

وەختێکی دەگەنەوە بۆ ماڵێ، کچە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێدەکا و فەرمووی دەکا، دوای دانیشتنێکی باش و لێك تێکگەیشتن، هەیاس دەڵێ: دەبێ لەگەڵم بێی؟



www.iqra.ahlamontada.com

کچەش دەڵێ: باشە.

وەختێکی هەیاس کچەی لەگەڵ خۆیدا دێنێ، لەرێیە پێی دەڵێ: بۆ خۆمم ناوێی، چونکە من ژنم هەیە، بەڵام وەزعێکی ئاوام لەگەڵ سوڵتان مەحموودی هەیە و بۆ ئەوم دەوێی.

هەرچەندە کچە پێی ناخۆش دەبێ، بەڵام دەڵێ: مادام هاتووم ناگەرێمەوە، ئەگەر بۆ خۆشت نەبێ.

دوای ئەوەی دەگەنەوە جێ، هەیاس جێ پێی سوڵتان محموودی لەدەورەی ماڵی خۆی هەست پێدەکا، بۆیە ناچێتەوە بۆ ماڵێ و روو لەدەشتێ دەکات و ماوەیەك ناچێتەوە بۆ ماڵێ.. هەتا رۆژێك سوڵتان مەحموود تووشی دەبێ دەڵێ: هەیاس بۆچی ناچیەوە بۆ ماڵێ؟

هەیاسیش دەڵێ: بێشەیەك شێری پێ فێربێ، تازە بەکەڵکی رێوی نایەتەوە.

سوڵتان مەحموودیش دەڵێ: راستدەکەی، کەچوو شێر بوو، بەڵام کەهاتەوە رێوی تەواویش نەبوو! ئنجا هەیاس دڵی چاك دەبێتەوە و دەچێتەوە بۆ ماڵێ و ئەو کچەی هێنابووشی لەگەڵ خۆی دەیدا بەسوڵتان مەحموود و بۆ خۆشی بەخێزانی خۆی شاد دەبێتەوە و ئەمنیش هاتمەوە و هیچیان نەدامێ.



www.iqra.ahlamontada.com

# چارەنووس

هەبوو نەبوو کەس لەخوای گەورەتر نەبوو. دەگێڕنەوە دەڵێن: ڕۆژێکی لەڕۆژان (هەیاس) و(سوڵتان مەحمود) پێکەوە دەچنە ڕاوێ، ئەوەندە دەگەڕێن، وەختێکی شەویان بەسەر دادێ و ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ ماڵێ لەبەر ماندوو بوون و کەنەفتیان، بۆیە لادەدەنە تاوڵێکی (ڕەشماڵێك) و شەوێ لەوێ دەمێننەوە. واڕێکدەکەوێ ئەو ماڵە لەو شەوەیدا کوڕێکیان دەبێ.

هەیاس بەسوڵتان مەحموودی دەڵێ: سوڵتان تازە شەوارەمان[1] هاتە سەرێ، دەبێ حەوت شەو و حەوت ڕۆژان بمێنینەوە.

سوڵتانیش دەڵێ: چارچییە دەمێنینەوە.

بەڵێ هەیاس و سوڵتان مەحموود حەوت شەو و حەوت ڕۆژان لەماڵی کابرای مانەوە. بەڕۆژێ دەچوونە ڕاوێ و بەشەوێش دەهاتنەوە و بەنۆرە، نۆبەدداریان[2] دەگرت. شەوی ئاخری نۆبەی هەیاسی دەبێ، دانیشێ بەدیار ئەو منداڵە ساوایەی.

---

١- شەوارە: واتا دانیشتن بەدیار منداڵی تازە لەدایك بوو، لە ئێوارەوە تا بەیانی. هەروەها جۆرە ڕاوێکی شەوانە لەدەشت دەکرێ بە چرا و شەداو.

٢- نۆبەداری: پاسەوانی. نۆبە: سەرە.



www.iqra.ahlamontada.com

لەنێوانی شەو و ڕۆژان، هەیاس شتێکی غەیبی دەبینێ لەدەلاقەیڕا دێ و شتێکی لەناوچاوانی ئەو منداڵەی دەنووسێ، ئەویش یەکسەر دەیگرێ و دەڵێ: ئەتۆ چی؟ ئەویش دەڵێ: ئەمن چارەنووسم.

ئەوجا هەیاس دەڵێ: چارەنووسی ئەو منداڵەی چییە؟

ئەویش دەڵێ: چارەنووسی ئەو کوڕەی لەکچی پاشای ئەو شارەی نووسراوە.

هەیاس سەری سووڕدەمێنێ! چونکە کچێ پاشای عازەبە و ئەو منداڵەش تازە بووە.

ئەو شەوەی شەوارە تەواودەبێ و بۆ سبەینێ ئەوماڵەی بەجێدێڵن و دەگەڕێنەوە.

لەڕێیە (هەیاس) زەردەیەکی دێتێ.

سوڵتان دەڵێ: ها هەیاس چ خەبەرە، بۆ زەردەت دێتێ؟

ئەوجا هەیاس مەسەلەکەی تێدەگەیەنێ و دەڵێ: چارەنووسی ئەو منداڵە و کچەکەت لەیەك نووسراوە. سوڵتان بەو قسەیەی زۆر دەشڵەژێ و دەڵێ: مادام وایە دەچم ئەو منداڵەی دەفەوتێنم.



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوجا سولتان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماڵەی و منداڵەکەیان بە زۆر لێدەستێنێ و دەیهێنێ لەڕێیە لەناو کلۆرەدارێکی[1] فڕێدەدا و بەجێیدێڵێ بۆ ئەوەی بمرێ.

دوای ساڵێکی وازێدەکەوێ هەیاس و سولتان مەحموود بەو ڕێیەیدا دێنەوە و دەبینن منداڵەکە هەروا دێ و دەچێ و (گاگۆڵکان)[2] دەکا لەو بن دارەی بۆ ئەو بن دارەی، لەو دەمەیدا هەیاس زەردەیەکی دێتێ.

سولتانیش ڕوو لەهەیاسی دەکا و دەڵێ: ئەوە چییە؟

هەیاسیش دەڵێ: ئەو منداڵەی دەتویست بیفەوتێنی، ئەوەتا گاگۆڵکان دەکا و بەدارەکەشدا هەڵدەگەڕێ و دێتەوە خوارێ.

سولتان مەحموود دەڵێ: شتی وا نابێ؟! ئنجا سندوقێکی دێنێ و منداڵەکەی تێدەخا و سەرەکەی دادەخاتەوە و بەزێیەیدا دەدا. دوای ئەوەی سندوقەکە ماوەیەکی بەو بەزێیەیدا دەڕواتە خوارێ، لە شوێنێکیدا ڕوو لەجۆگایەکی دەکا، ئەو جۆگایە ماڵێك هەڵیانبەستووە بۆ ئاشی، ساحێبی ئەو ماڵەی ژن و پیاوێك دەبن و

---

١- کلۆرەدار: دار کەتەمەنی زۆر دەبێ و قەدی تەواو ئەستوور دەبێ، ناوەڕاستەکەی کلۆر واتە بەتاڵ دەبێ و بەتەواوی بۆشایی پەیدادەکات کە زۆرجار جێگەی مرۆڤی تێدا دەبێتەوە.

٢ – گاگۆڵکە: وەختێك منداڵ تەمەنی دەگاتە (٩-١٢) مانگ لەسەر دەست و ئەژنۆی دەڕوات بەو ڕۆیشتنەی دەڵێن گاگۆڵکە.



www.iqra.ahlamontada.com

منداڵێکیان دەبێت و تازەش ئەو منداڵەیان مردووە، وەختێک ئەو سندوقە بەری قۆتەڵەی[1] ئاشەکەی دەگرێ، هەردووکیان پێیان سەیردەبێت، بۆیە ژنەکە ڕوو لەپیاوەکەی دەکا، دەڵێ: پیاوەکە بچۆ بزانە ئەوە ڕەقەیە چییە، بەری ئاوەکەی گرتووە؟

ئەوجا پیاوەکە هەڵدەستێ و دەچێ، وەختێکی تەماشا دەکا، دەبینێ ئەوە سندوقێکە بەری ئاوەکەی گرتووە و ئاوەکە بەسەر ئاشەکەی گەڕاوە، ئنجا سندوقەکەی دەردێنێتەوە و دەیباتەوە بۆ ماڵێ و لەگەڵ ژنەکەی هەڵیدەپچڕن. تەماشادەکەن، منداڵێکی زۆر لەئێ خۆیان جوانتری تێدایە. ئەوجا منداڵەکەی دەردێنن و خزمەتی دەکەن تاگەورە دەبێت، هەتا ڕۆژێکی لەدەوری ماڵی خۆیان خەریکی نەمام چاندنێ دەبێ، دیسان بەڕێکەوت هەیاس و سوڵتان مەحموود بەوێدا تێدەپەڕن و چاویان پێدەکەوێ، سەرلەنوێ هەیاس زەردەیەکی دێتێ. سوڵتانیش دەڵێ: چییە هەیاس خێرە پێدەکەنی؟

هەرچەندە هەیاس دەڵێ: هیچ نییە، بەڵام سوڵتان سووردەبێ لەسەر ئەوەی کە پێی بڵێ، بۆیە لێی دووبارەدەکاتەوە.

---

١- قۆتەڵە: ئەو شوێنەی یان ئەو گەرووەی ئاوەکەی لێدەچێتە ناو سووڕانەوەی بەرد ئاشەکەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

ئـەوجا هـەیاس دەڵـێ: کارێـك خـوا ئـەمری لەسـەر بـێ، بەکـەس ڕەتناکرێتەوە.

سوڵتان دەڵێ: مەخسەدت چییە؟

هەیاسـیش دەڵـێ: ئـەو منداڵـەی خـستە نـاو سـندوقەکەیەوە و بەزێیەت دادا، ئەوەتانێ نەمامان دەچێنێ.

سوڵتان تووڕە دەبێ و دەڵێت: شتی وا نـابێ و هـەر دەیفـەوتێنم، هەر بۆیـە بـانگی کـوڕەی دەکـا و نامەیـەکی دەداتـێ و پێـی دەڵـێ: دەبێ ئەو نامەیەم بۆ ببەی بۆ شاری غەزنـەی. هـەر چـەندە کـابرای ئاشەوان دەڵێ: سـوڵتان کوڕەکـەم منداڵـە و ئـەو کـارەی پێنـاکرێ، بەڵام کوڕەکەی دەڵێ: قەیناکا بابە بێ خەمبە دەچم.

بەڵێ، کوڕە دەڕوا تادەگاتـە نزیکـی ئـەو شـارەی و لـەوێ تووشـی کانی و ئاوێکی خۆش دەبێ، لەئەسپەکەی دێتـەخوارێ و دەسـتنوێژ دەگرێ و نوێژێکی دەکا، پاشـان سـەر بـە بـەردێکی دەکـا و خـەوی لێدەکەوێ.

کچێ سوڵتان مەحموودیش کەڕۆژانە دێتە سەر ئەو کانی و ئاوەی و هەر بەکانی ئەویش ناسراوە، واڕێدەکەوێ ئـەو کاتـەی کـوڕە خـەوی لێدەکـەوێ، ئـەویش دێتـە سـەر ئـەو کانییـەی و هـەر کەچـاوی پێدەکـەوێ، یەکـسەر ئاشـقی دەبـێ. دوای ئـەوەی زۆر بـەوردی سـەرنجی دەدا، چـاوی بەنامەیـەکی لـوولکراو دەکـەوێ لەناوپێـچی



www.iqra.ahlamontada.com

مێزەرەکەیدا، ئنجا نامەکەی دێنێتە دەر ودەیخوێنێتەوە و تێیدا نوسراوە: بەگەیشتنی ئەو کوڕەی یەکسەر لەسەریدەن و لەخوارێش ئیمزای بابی پێوەیە.

هەر بۆیە دەستبەجێ ئەو نامەیەی دەدڕێنێ و نامەیەکی دیکە دەنووسێ و دەڵێ: بەگەیشتنی ئەو کوڕەی یەکسەر کچی سوڵتانی لێمارەکەن و حەوت شەو و حەوت ڕۆژان شایی بۆ بکەن و دەیخاتەوە ناو پێچی مێزەرەکەیی و کوڕەی بەجێدێڵێ.

ئنجا دوای ئەوەی کوڕە بەخەبەر دێ، هەڵدەستێ و ڕوو لەئاوەدانی دەکا، لەوێ یەکسەر نامەکەی لێوەردەگرن و دوای خوێندنەوەی دەستبەجێ کچێ سوڵتان مەحمودی لێمارە دەکەن و دەستدەکەن بە شایی و لۆغان.

دوای چەند ڕۆژێکی هەیاس و سوڵتان مەحموود دەگەڕێنەوە بۆ شاری غەزنەی و لەدوورەوە گوێیان لە دەهۆڵ و زوڕنای دەبێ، دیسان هەیاس زەردەیەکی دێتێ و سوڵتانیش دەڵێ: چییە دیسان هەیاس بۆ پێدەکەنی؟

ئەویش دەڵێ: هەرچی خوا ڕەزای لەسەر نەبێت نابێت!

سوڵتانیش دەڵێ: چۆن؟

ئەوجا هەیاس دەڵێ: ئەو کوڕەی نامەکەت پێدا نارد تا لەسەریدەن، ئەوەتا لەجیاتی ئەوەی لەسەریدەن، ئەوە کچەکەی



www.iqra.ahlamontada.com

تۆیان لێمارەکردووە و ئەو شایی و لۆغانەش ئی وییە. ئنجا سـولّتان دەڵێ: صەددەق!

هەیاسـیش دەڵـێ: هـەتا نەتـدا لـە تەبـەق، نـەتگوت صــەددەق و ئەمنیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

※※※※※



www.iqra.ahlamontada.com

## خدر شێخە ئەحمەد:



لەساڵی (1922) لە گوندی (سندۆڵان) لەناوچەی پشدەر لەدایك بووە. دوای دروستکردنی بەنداوی دوکان لەساڵی (1959)دا، دەچێتە بەکرەجۆ تاکوو دواساتەکانی تەمەنی هەر لەوێ دەمێنێتەوە. نەخوێندەوارە و تەنیا یەك ژنی هێناوە و خاوەنی هەشت کوڕ و یەك کچە. لەکۆڕ و کۆبوونەوەی شەوانەی ناو خێزاندا لەڕێی بیستن و گوێ لێبوونەوە چیرۆکەکان فێربووە. تاکوو ئامادەکردنی کتێبەکەش لەژیاندا مابوو، بەڵام نەخۆش و لەسەر جێگا بوو، بەداخ و بەژارەیەکی زۆرە لەکاتێکدا ئەم بەرهەمە لە ژێر چاپدابوو لە شەوی (2008/8/7)دا ماڵ ئاوایی لە ژیان کرد و ئەم بەرهەمەشی بۆ کەلەپووری نەتەوەکەی بەجێهێشت...

R_bakrajoy@hotmail.com

www.iqra.ahlamontada.com